## ناسنامەی کتێب


ناوی پەرتوك : (٥٠٠) پرسیارو وەڵام

بابەت : ئایینی

ئامادەکردنی: خالد مەحمود خادم سروجی

وەرگێران : شەوبات عەبدوڵڵا

ئامادەکردنی نوسەبیە مەحمود

نەخشسازی : کۆمپتەری هیوا

چاپ: (چاپی یەکەم/ ٢٠٠٧)- (دووەم/ ٢٠٠٨)

شوێنی بلاوکردنەوە: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١١٥٣ )ی ساڵی( ٢٠٠٧ )ی پێدراوە.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

هەولێر – کوردستان – عیراق

(٠٦٦ ٢٢ ٣٣ ٨٦٨- ☎ / ١٩ ١٩ ١١٨ ٠٧٥٠ – / ٩٤ ١٣ ٤٦٧ ٠٧٥٠)

( ٥٠٠ )

# پرسیار و وەڵامی ئایینی

## ٢٥٠ پرسیار و وەڵام
## لەبارەی قورئانی پیرۆز


ئامادەکردنی

**خالد مەحمود خادم سروجی**


## ٢٥٠ پرسیارو وەڵام
## لەبارەی ژینامەی پاکی پێغەمبەر ﷺ


ئامادەکردنی

**نوسەییە مەحمود**

وەرگێرانی

**شەوبات عەبدوڵڵا**

# پێشەکی

سوپاس وستایش بۆخوداو درود بـۆ پێغەمبـەری پێشەوا.ئامـانجی سـەرەکی لەنوسـینی هـەرکتێب وپـەڕاوێك فێرکردنەبـەجیاوازی چـۆنیەتی وئاسـتەکانیەوە،یەك لەوشـێوازانەی بـۆفێرکردنیش کاریگـەرن شـێوازی پرسـیارو وەڵامە،ئەوزانـست وزانیاریانـەی بەپرسـیارو وەڵام دەخرێنـە ڕوو زووترو زیاترلای خوێنەرجێگیردەبن ودرەنگتربیردەچنەوە، بۆیە پـێم وایـە نوسـەرانی ئـەم نامیلکەیـە زیرەکانەمامەڵـەی لەگـەڵ بابەتەکـەی کـردووە، لـەبارەی قورئـانی پـیرۆزو ژیاننامـەی پێغەمبـەر(د.خ)ی بەپرسـیارو وەڵام، ختسویانەتە بەردەستی خوێنەران.ئەمەوای کردووە نامیلکەکەی بۆهـەموو خوێنـەران بـەجیاوازی ئاسـتەکانی خوێنـدەواری وتەمـەنیان لێـی بەهرەمەنـدبن وسـودی لێـوەربگرن.وەرگێڕانـی نامیلکەیـەکی بـەم جـۆرە بۆزمـانی شـیرینی کـوردی پێویـستە چـونکەخزمەتکردنی قورئـانو سەربردەی ژیانی پێغەمبەر(د.خ)بەشێوازو جۆری جیاجیا زۆر پێویستە و گەنجینـەکانی نێودەریـای ژیـانی ئـەم پێغەمبەرەپایـەدارە لـەبن نایە،وەرگێڕتوانویـەتی بەکوردیـەکی ساکارو بـێ گـرێ نامیلکەکـەوەرگێڕێ، ئەمـەش ئاریکارەبۆئـەوەی پڕپەیامەکـە بگـەینێ کـەفێرکردن وسوودگەیاندنە بەخوێنەران.خوای گەورەش دەفەرموێ ﴿ لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة﴾

*بەهیوای بەهرەو سوودی دونیاودوایی بۆهەمووان*

**ژیوانی گەلالی**

# لەزانستەکانی قورئان

١- پێناسەی قورئانی پیرۆز چی یە؟

**و/ قورئــانی پــیرۆز چــەند ئایەتێکــە کــەبۆ پیغەمبــەر (ص)هــاتوە خوارەوەبــەهۆی جبریل،کەلــەکتێب نوســراوەتەوە و بەتــەواتور هــاتووە خوێندنەوەی عیبادەتە.**

٢- ژمارەی ئایەتەکان لەقورئانی پیرۆزدا چەندە؟

**و/ ژمارەی ئایەتەکان لەقورئانی پیرۆزدا (٦٢٣٦)شەش هەزارودووسەدو سی وشەش ئایەتە.**

٣- ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز چەندە؟

**و/ ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز(١١٤)سەدو چواردە سورەتە.**

٤- ژمارەی ووشەکانی قورئانی پیرۆز چەندە؟

**و/ ژمارەی وشەکان لەقورئانی پیرۆزدا (٧٧٩٣٤)حەفتاو حەفت هەزارو نۆسەدو سی وچوار وشەیە.**

٥- یەکـەم ئایـەت لـەقورئانی پیرۆزدابـۆ پێغەمبـەر(د.خ) هاتۆتـە خوارەوە کامەیە؟

و/ أقرأ بأسم ربك الذي خلق **تاكو** علم الأنسان مـا يعلـم

**(العلــق/١-٥) واتــه (ئــەی موحەممــەد(د.خ) بخوێنــه بــەناوی ئەوپەروەردگارەتەوە، کەهەموو شــتێکی دروســت کــردووە) تـا کو(ئـەو زاتەیە کەبەهۆی قەڵەمەوە زانست وزانیاری فێرکردووە)**

٦- دوا ئایــەتی قورئــانی پــیرۆز، کــە بــۆ پێغەمبــەر(د.خ)هاتۆتــە خوارەوە لەلایان خوای گەورە کامەیە؟

و/ ﴿وأتقوا يوماً ترجعونَ فيهِ ا ا ـِ ثُم تو كُلُ نفسٍ ماكَسبت وهـم لايظلَمون﴾ **(البقـرة/٢٨١) واتـه : لەسـزاو تۆڵـەی رۆژێـك بترسـن، کەتیایدا بۆلای خوای گــەورە دەگەڕێنــەوە، لــەوەو دوا هــەموو کــەس پاداشتی کــارو کــردەوەی خــۆی وەردەگرێــت و کــەس ســتەمی لێ ناکرێــت. ئــەوەش هەشــتاو یــەك ڕۆژ پــێش کۆچــی دوایــی کردنــی پێغەمبەر(د.خ)بوو.**

٧- ئەو ووشەیەی کەزۆرترین جار لەقورئانی پیرۆزدا نـاوی هـاتووە کامەیە؟

**و/ ئەو ووشەیەی زۆرترین جار لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە ووشەی ﴿الله﴾ یەو (١٦٩٧)جار ناوی هاتووە .**

٨- لەســەردەمی کامــە خەلیفــەی ڕاشــدین قورئــانی پــیرۆز لــەزاری پیاواندا کۆکرایەوە و کرایە یەك کتێب؟

**و/قورئانی پیرۆز لەکاتی خەلیفـەی پێغەمبــەر(ر.خ)ی خوائەبوبــەکری**

**صديق(د.خ)لەزاری پیاواندا کۆکرایەوەو کرایە یەك کتێب.**

٩- هۆی چی بوو ئەبوبەکری سدیق قورئانی پیرۆزی کۆکردەوە؟

**و/ هۆیەکەی ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر لەوانەی قورئانی پیرۆزیان لەبەر بوو لەجەنگی(یەمامە) شەهید کران و ترسان لە نەمانی قورئانی پیرۆز.**

١٠- یەکەم کتێبی قورئانی پیرۆز دوای کۆکردنەوەی لەکوێ هەڵگرت ؟

**و/لەلای ئەبوبەکری سدیق هەلگیرا،دوای کۆچی دوایی کردنی، گوازرایەوە بۆلای عومەری کوری خەتاب،دوایی کۆچی دوایی کردنی ئەویش، گوازرایەوە لای حەفسەی کچی عومەری کوری خەتابی دایکی موسڵمانان.**

١١-بۆچی لەکاتێك پێغەمبەر(د.خ)لە ژیاندا، مابوو، قورئانی پیرۆز کۆنەکرایەوە؟

**و/ لەبەر ئەوەی کەلە ژیاندابوو قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهاتە خوارەوە پێغەمبەریش ﷺ چاوەڕێی ئەوەبوو، هێشتا قورئان دابەزێ یانەسخ بێتەوە ئەوبڕوایەشی هەر هەبوو تاکۆچی دوایی کردنی ﷺ.**

١٢-مەبەست چی یە لە کتێبی ئەل ئیمام؟

**و/مەبەست لە (الإمام) کتێبی خەلیفەی راشیدی عوسمانی کوری عەفان (خ).**

١٣-عوسمانی کوری عەفان (خ) چەندژمارەی لەقورئانی پیرۆز

روونوسکرد، پێش ئەوەی کتێبەکانی دی بنوسێت؟

**و/ ژمارەیان حەوت کتێب بوو.**

١٤- ئیمامی عوسمان چی لەو حەوت ژمارەیەی قورئانی پیرۆز کرد، کەلەلای بوو،لای خۆی هەڵیگرت یاناردیە شوێنێکی دیکە؟

**و/بەو شێوەیەی دابەش کردن: بۆ هەریەك لەم شارانە قورئانێکی نارد، مەککە، شام، یەمەن، بەحرێن، بەسرا، کوفەو قورئانێکی لەلای خۆی لەمەدینەی مونەوەرە هێشتەوە.**

١٥- جیاوازی لەنێوان کۆکردنەوەی قورئانی ئەبوبەکری سدیق لەگەل کۆکردنەوەی عوسمانی کوڕی عەفان چی بوو؟

**و/کۆکردنەوە لەسەردەمی  ئەبوبەکری سدیق ئەوە بووکە قورئانی لە زاری پیاوان و لەویاوەرانەی قورئانیان ئەزبەربوو، لە پێغەمبەر(د.خ)گوێیان لێ بوو، بەرێك وپێکی نوسیبویەوەو لەیەك کتێبی باوەڕ پێکراو کۆیکردبووەوە، هەرچی عوسمانی کوڕی عەفانە چەند ژمارەیەکی لەکتێبەکەی ئەبوبەکر ڕونوسکردەوەو بۆهەموو لایەکی نارد بۆئەوەی خەڵکی لەسەر یەك کتێب کۆڕا بن، دوای ئەوەی جیاوازی لەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا بیستبوو.**

١٦- قورئانی پیرۆز ناوی تری هەنە؟حەفت ناویان بڵێ؟

**و/ بەڵێ قورئانی پیرۆز ناوی دی هەنە وەکو: (ئەلفورقان، ئەلکتاب،**

**ئـــەلــذیكـــر، ئەلتـــەنزیل، ئەلـــشیفا ء، ئەلـــسیرات، ئەلموســـتەقیم، ئەلعیروەتولوسقا) سـیوطی پەنجاوپێنج نـاوی قورئـانی پـیرۆزی بـاس كردووە.**

١٧- كێ یەكەم كەس بوو كەخاڵی بۆقورئانی پیرۆز دانا؟

**و/ئەبولئـەسوەد ئەلدەئولی یەكەم كەس بوو خاڵی بۆ قورئـانی پـیرۆز دانا.**

١٨- پێغەمبەر(د.خ)فەرمووی (قورئانی پـیرۆز لەسـەر حـەوت پیـت هاتۆتە خوارەوە) ئەو حەوت پیتە چین؟

**و/ئـەو حـەوت پیتـە لێـرە بـە مانـای :زمانـەكان و شـێوازە كـانی عەرەبەكان، دێت ئەوەش بۆ ئاسانكردن و سوككردنە.**

١٩- جیاوازی لەنێوان ئایەتی مەككی و ئایەتی مەدەنی چیە ؟

**و/ ئایـەتی مـەككی ئـەو ئایەتانـەن كـەپێش كۆچـكردن بۆمەدینـە دابەزیون،ئایـەتی مـەدەنیش ئـەو ئایەتانـەن كـەدوای كۆچـكردنی پێغەمبەر(د.خ)بۆ مەدینەی مونەوەرە دابەزیون.**

٢٠- چۆن یاوەرەكانی پێغەمبەر(د.خ)ئایەتەكانی قورئانیان لـە وون بوون پاراستووە؟

**و/ لەلایـەك قورئـانی پیرۆزیـان بەئەزبـەركردن(حفـظ)پاراسـتووە، لەلایەكی تریش بەنووسینەوە لەسەر پێستوو بـەرد و لەسـەر گـەڵای -دارخورما-و لەسەر هێسكی شانەكان.**

٢١-ژمـــارەی ئەوکەســـانەی قورئـــانی پیرۆزیـــان لەئەزبـــەر بـــوو، لەجەنگی ئەلیەمامە شەهید کران چەند بوو؟

**و/ ژمارەیان حەفتا کەس بوو .**

٢٢-سورەت لەقورئانی پیرۆزدا مانای چی یە؟

**و/ واتە: پارچەیەك لەقورئان،بۆیەش نـاوی سـورەتی لێنـراوە چـونکە چـەند ئایـەتێکی قورئـانی کۆکردۆتـەوە وەکـو کۆبونـەوەی چـەند خانوویەك و دەورەدانیان.**

٢٣-ئایا دەبێ سورەتێکی قورئان چەند ناوێکی هەبێ؟

**و/ سورەتەکان یەك ناویان هەیـە ،هەنـدێ سـورەتیش دوو نـاو یـان زیاتری هەیە بۆنمونە(الفاتحة)پێی دەگوترێ دایکـی قورئـان وئەلـسەبع ئەلمەثانی.**

٢٤-حوکمی ڕێکخستنی سورەتەکان لەقورئاندا چیە؟

**و/ ڕێکخـستنی سـورەتەکانی قورئـان تەوقیفیـە، واتـە دەوەسـتێتە سەرفەرمانی خوای گەورەو پێغەمبەر(د.خ)مەودای ئیجتهادکردنی نیـە. لەلای خوای گەورە لەلەوحی مەحفـوظ بەورێکخستنەیە، هەربەو جۆرەش پێغەمبەر(د.خ)ئەو قورئانەی لەلای کۆدەبوەو بۆ جبریلـی دەخوێنـدەوە وە ئەو ساڵەی پێغەمبـەر(د.خ)کۆچـی دوایـی کـرد دوجـار قورئـانی بۆجبریل خوێندەوەو دوائایەت کەدابـەزی:** (وأتقوا يوماً ترجعونَ فيهِ ا

ا ـ ثُم تو  كُلُ نفسٍ ماكَسبت وهم لايظلَمون﴾ (البقـرة/٢٨١) **واتـه: لەسزاو تۆڵەی رۆژێك بترسن، كەتیایدا بۆلای خوای گەورە دەگەڕێتەوە، لەوەو دوا هەموو كەس پاداشتی كارو كردەوەی خـۆی وەردەگرێـت و كەس ستەمی لیٚ ناكرێـت.جبریـل فـەرمانی پێكـرد كەلـەنێوان دوو ئایەتی ریباو ئەلدەینی دابنیٚ لەسورەتی ئەلبەقەرەدا.**

٢٥-قورئانی پیرۆز بەیەك جار دابەزی یا بەچەند جارێك؟

**و/ یەكەم جار قورئانی پـیرۆز بەیـەك جـار لـە لـەوحی مـەحفوزەوە بۆئاسمـانی دونیـا دابـەزی،دوای ئـەو بەچـەند جارێـك بـەگوێرەی رووداوەكان دادەبەزی و چۆن لە لەوحی مـەحفوز رێكخـراوەو جـێگیر كراوە ئاواش لەقورئان جێگیر كراوە.**

٢٦-ئەو حەوت سورەتە درێژەی لەقورئانی پیرۆزدا هاتوون كامەن؟

**و/ سـورەتەكانی (ئەلبەقـەرە، ئـال عیمـران، ئەلنیـساء، ئەلمائیـدە، ئەلئەنعام، ئەلئەعراف، ئەلئەنفال) ئەو سورەتانە بەدووسەدیش نـاونراون چونكە هەر سورتێكیان لەسەد ئایەت زیاترە یالێی نزیكە.**

٢٧-ئەو سورەتانەی بەناوی پێغەمبەرانەوە كراون كامانەن؟

**و/ سورتەكانی (یونس، هـود، یوسـف، ئیـبراهیم، موحەممـەد، نـوح، موزەمیل، مودەثیر).**

٢٩-ئەو سورەتانەی بەناوی رۆژی قیامەت وباس وخواسیەوەكراون كامەن؟

**و/سورەتی (ئەلدوخان، ئەلواقیعە، ئەلحەشر، ئەلتەغابون, ئەلحاققە، ئەلقیامە، ئەلتەکویر، ئەلئینفیطار، ئەلئینشیقاق، ئەلغاشیە، ئەلزەلزەلە، ئەلقاریعە).**

٣٠- ئەدوو سورەتەی بەووشەی(هل)دەست پیێ دەکات کامەیە؟

**و/ سورەتی ئەلئینسان** ﴿هل اتى على الإنسان حِين من الدهر لم يكُن شيئاً مذكوراً﴾ **واتە: (بەراستی ماوەیەکی زۆر لەرۆژگار بەسەر ئادەمیزاددا هات کەشتێکی وانە بوو ناوببرێت) سورەتی ئەلغاشیە** ﴿هلْ أتاك حدِيثُ الغاشِيةِ﴾ **واتە: (ئایا هەواڵ ودەنگوباسی رۆژی قیامەتت پێگەیشتووە)؟!**

٣١- ئەوسورەتانەی بەووشەی (قل)دەستپێدەکات کامەن؟

**و/ پێنج سورەت بە ووشەی(قُل)دەستپێدەکەن، ئەوانیش:**

**١-سورتی ئەلجن** ﴿قُل أوحِى إليّ أنه استمع نفر مِن الجن فقالواْ إنا سمِعنا قُرءاناً عجباً﴾ **واتە: (ئەی موحەممەد(د.خ)پێیان بڵێ : وەحی ونیگام پێراگەیەنراوە کەدەستەیەك جن گوێیان لەقورئان گرتووەو پێی سەرسام بوون)**

**٢- سورەتی ئەلکافیرون** ﴿قُل يأيها الكفِرونَ﴾ **واتە:(ئەی محەمەد (د.خ)بڵێ:ئەی کۆمەڵی بێ باوەرو خوانەناسان)**

**٣-سورەتی ئەلئیخلاس** ﴿قُل هو الله أحد﴾ **واتە (ئەی محەمەد بڵێ**

**ئەوخوایەی کەناوی الله یە، خوایەکی تاك وتەنهایە)**

**٤- سـوڕەتی ئەلفەلـەق** ﴿قُـل أعـوذُبِـربِ الفَلَـقِ﴾ **واتـە (ئـەی موحەممـەدبڵێ: پـەنادەگرم بـەو پـەروەردگارەی بەرەبـەیان پـێش دەهێنێت)**

**٥- سـوڕەتی ئـەلناس** ﴿قُـل أعـوذُبِـربِّ النـاسِ﴾ **واتـە (ئـەی موحەممەدبڵێ:پەنا دەگرم بەپەروەردگاری خەڵکی).**

٣٢- ئـەو سـوڕەتانە کامـەن، کـەناوەکانیان لـەکۆتایی ئایەتەکانیانـدا هاتووە؟

**و/ سوڕەتی ئـەلماعون** ﴿ويمنعونَ الـماعونَ﴾ **واتـە (هەمیـشە هـەوڵ دەدەن بۆقەدەغەکردنی هەموو چاکەو یارمەتی و هاوکاریەك) سوڕەتی ئەلمەسەد** ﴿فـي جِيدِها حبلٌ مِن مسد﴾ **واتە (هەمیشە گوریسێکی چنراو لەپووشی خورما لەگەردەنیەتی، لەقیامەتیش زنجیری ئاسـنی دەکرێتـە گەردەنی).**

٣٣- ئەوسوڕەتانەی قورئان کامەن، کەبەناوی ئاژەڵ ناونراون؟

**و/سوڕەتی (ئەلبەقەرە، ئەلئەنعام، ئەلنەحل، ئەلنـەمل، ئەلعەنکـەبووت، ئەلعەلەق، ئەلعادیات، ئەلفیل).**

٣٤-ئەسـوڕەتانە کامـەن کـەناوەکانیان لـەهیچ یـەك لەئایەتەکانـدا نـەهاتووە؟

**و/ ئەوانیش سێ سوڕەتن.**

**١- سوڕەتی ئەلفاتیحە:چونکە سـەرەتای قوڕئانـەو لەهـەموو نوێژێکـدا هەیە.**

**٢- سوڕەتی ئەلئەنبیأ:چونکە چیرۆکی زۆربەی پێغەمبەرانی تێدایە.**

**٣- سوڕەتی ئەلئیخلاس:چونکە مانـای وەفاداریـە بـۆ تـاکیی خـوای گەورە.**

٣٥- ئەوسوڕەتانەی قوڕئان کەبە ووشەی(إنّا)دەستپێدەکەن کامەن؟

و/ ١- **سوڕەتی ئەلفـەتح :** ﴿إنافتحنا لك فتحـاً مبينـا﴾ **واتـە(ئـەی موحەممەد (د.خ) بەڕاستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت).**

**٢- سوڕەتی نوح:** ﴿إنا أرسلْنا نوحاً ا قومِهِ﴾ **واتـە (بەڕاسـتی ئێمـە (نوح) مان ڕەوانە کردبۆلای قەومەکەی)**

**٣- سوڕەتی ئەلقەدەر:** ﴿إنا أنزلْناه ـ ليلَةِ الْقَدرِ﴾ **واتە (ئێمە قوڕئانمان لەشەوێکی بەفەرو ڕێزداردا دابەزاندۆتە خوارەوە)**

**٤- سوڕەتی ئەلکـەوثـەر:** ﴿إنـا أعطَينـاك الكـوثَر﴾ **واتـە** ﴿**ئـەی موحەممەد(د.خ) ئێمە خێرو چاکەو خۆشی تۆمان، بـێ ئەنـدازەو بـێ سنوورکردووە**﴾ **.**

٣٦- ئەوسـوڕەتانەی قوڕئـان کەبـە ووشـەی (سَـبَحَ)دەسـپێدەکەن **کامەن؟**

**و/ ئەوانیش:**

**١- سورەتی ئەلحەدیـد** ﴿سبح لِلهِ ما ـ السمواتِ والأرضِ وهو ٱلعزيـز ٱلحكيم﴾ **واتـە: هەرچـی لەئاسمانـەکان وزەویـدا هەیـە تەسـبیحات وستایشی خوا دەکات،ئەویش زاتێکی باڵا دەست ودانایە.**

**٢-سورەتی ئەلحەشـر** ﴿سبح ـ ما ـ السمواتِ ومـا ـ الأرضِ وهـو ٱلعزيزا كيم﴾ **واتە: هەرچی لەئاسمانەکان وزەویدا هەیـە تەسـبیحات وستایشی خوا دەکات،ئەویش زاتێکی باڵا دەست ودانایە.**

**٣-سورەتی ئەلسەف** ﴿سبح ـ ما ـ الـسمواتِ ومـا ـ الأرضِ وهـو ٱلعزيزا كيم﴾ **واتە: هەرچی لەئاسمانەکان وزەویـدا هەیـە تەسـبیحات وستایشی خوا دەکات،ئەویش زاتێکی باڵا دەست ودانایە.**

٣٧-ئـەو دوو سـورەتەی قورئـان کامەنـە، بـە ووشەی(لاأقسِم)دەستپێدەکەن؟

**و/١- سورتی ئەلقیامـە** ﴿لاأقسِم بيومِ القِيامةِ﴾ **واتـە: سـوێند دەخـۆم بەڕۆژی قیامەت.**

**٢- سورەتی ئەلبەلـەد** ﴿لا أقسِم بهذا ٱلبلدِ﴾ **واتـە: سـوێندبەم شـارە واتە(شاری مەککە)**

٣٨-ئەوسورەتانەی قورئان کەپێیان دەگوترێ (الطواسين)کامەن؟

**و/ ئەوانیش:**

**١- سورەتی ئەلنـەمل** ﴿طس تلك آيت القُرءانِ وكِتابٍ مـبـ﴾ **واتـە:**

**ئەوە ئایەتەکانی ئەم قورئانەن و فەرمانی کتێبێکــی پــیرۆزو ئاشــکراو روونە.**

**٢- سورەتی ئەلشوعەراء** ﴿طسم تلك ايـٰت الكِتـٰابِ المُبـِين﴾ **واتــە: ئەوسورەتە چەندین ئایەتە لەئایەتەکانی قورئانی ئاشکراو روون**

**٣- سورەتی ئەلقەصەص** ﴿طسم تلك ايـٰت الكِتـٰابِ المُبـِين﴾ **واتــە: ئەوسورەتە چەندین ئایەتە لەئایەتەکانی قورئانی ئاشکراو روون.**

٣٩- ژمـارەی ئەوسـورەتانەی قورئـان چـەندن کەبەچـەند پیتێکـی پارچەکراو ودەستپێدەکەن؟

**و/ ژمارەیان بیست ونۆ سورەتە.**

٤٠ -ئــەو دوو ســورەتەی قورئــان کەبــە ووشــەی(تبــارك)دەســت پێدەکات کامەن؟

**١- سورەتی ئــەلفرقان** ﴿تبارك ٱلَّذي نزلَ ٱلۡفُرقانَ على عبـدِهِ ليكـونَ لِلۡعالَمِين نذِيراً﴾ **واتە: بەرزو پیرۆزو پاك وبڵندە ئەو زاتــەی کــەقورئانی دابەزاندووە، تابێتە هوشیار کەرەوەی هەموو جیهان**

**٢- سورەتی ئــەلمولك** ﴿تبارك ٱلَّذي بِيدِهِ ٱلۡمُلۡك وهو على كُـلِ شـيءٍ قَدِير﴾ **واتە: گەورەو موبــارەك وپیرۆزە،ئەوزاتــەی کەهــەموو بونــەوەرو جیهانی بەدەستەو دەسەڵاتی هەموو شتێکی هەیە.**

٤١- ئەوسـورەتانەی قورئـان کەئایـەتی دەسـتپێکردنیان وەکو یەکە

**کامەن؟**

**و/ئەوانیش:**

**١- سورەتی ئەلشوعەراء و ئەلقەصەص** ﴿طسم*تِلْـك آيـت الكِتـابِ الْمبِ﴾ **واتە: ئـەو سـورەتە چـەند ئایەتێکـە لەئایەتـەکانی قورئـانی ئاشکراو ڕوون**

**٢- سورەتی ئـەلزوخروف و ئەلـدوخان کـەخوای گـەورە دەفـەرمووێ** ﴿حم*والكِتابِ الْمبِ﴾ **واتە: سوێند بەوقورئانە ڕوون وئاشکرایە.**

**٣- سـورەتی ئەلجاسـیەو ئەلئـەحقاف کـەخوای گـەورە دەفـەرمووێ** ﴿حم*تَ يلُ الكِتبِ مِن اـ العزيز ا َكيمِ﴾ **واتە: ئەم قورئانـە لەلایـەن خوای باڵادەست وداناوە هاتۆتە خوارەوە**

**٤-سورەتی ئەلحەشروئەلصەف،کەخوای گەورە دەفـەرموێ** ﴿سـبح ـ ماـ السمواتِ ومـاـ الأرضِ وهـو الْعزِيـزا كيم﴾ **واتـە: هەرچـی لەئاسمانەکان وزەویدا هەیە، تەسبیحات وستایشی خوا دەکات،ئـەویش زاتێکی باڵا دەست ودانایە.**

٤٢-ئەوسورەتانەی قورئان کامەن، ناوی سورەتە، لەووشەی یەکەمدا هاتووە؟

**و/١- ئەلحاقـە** ﴿الْحاقّه*ماالْحاقّه*وماأدريك ماا اقة﴾ **واتـە: یەکێکـە لەناوەکانی ڕۆژی قیامەت ئـەوە دەگەیـەنێت کـەخوای گـەورە حـەق وراستی بەتەواوی دەچەسپێنێت**

**٢- ئەلقاریعە** ﴿ٱلْقَارِعَةُ* مَاٱلْقَارِعَةُ*ومَاأدرىٰك مَاٱلْقَارِعَةُ﴾ **واتە: یەکێکە لەناوەکانی ڕۆژی قیامەت واتە ئەو گرمەیەی دڵان دەلەرزێنێت ئاخۆ القارعە چی بێت، تۆئەی ئینسان چی فێری کردویت القارعە چیە.**

**٣-عەبەسە** ﴿عبس وتو ﴾ **واتە: ڕووی گرژ کردو ڕووی وەرگێرا.**

**٤-ئەلرەحمان** ﴿ألرحمن*علم ٱلْقُرانَ﴾ **واتە: خوای میهرەبان کانگای سۆزو ڕەحمەت، قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە.**

٤٣-ئەوتاکە سورەتەی قورئان کامەیە، بەپێنج پیتی پارچەکراو دەستپێدەکات؟

**و/ سورەتی مەریەمەو بە** ﴿كهيعص﴾ **دەست پێدەکات.**

٤٤-ئەو دووسورەتەی قورئان کامەنە، کە بەووشەی. قد. دەستپێدەکات؟

**و/ ١- سورەتی ئەلموئمنون** ﴿قَدأَفْلَح ٱلْمُؤمِنونَ﴾ **واتە: بەڕاستی ئەوبڕوادارانە سەرکەوتوو سەرفرازبوون.**

**٢- ئەلموجادیلە** ﴿قَدسمِع ٱللَّه قَولَ ٱلَّتي تجدِلُك﴾ **واتە: ئەی موحوممەد(د.خ)خوابیستی و وەریگرت، و توێژی ئەو ئافرەتەی کە گفتوگۆی لەگەڵتدا کرد.**

٤٥- ئەوسورەتانەی قورئان کامەن کەبە ( ا ) دەست پێدەکەن؟

**و/ سورەتی (ئەلبەقەڕە، ئالی عیمران، ئەلرۆم، ئەلعەنکەبوت، لوقمان،**

**ئەلسەجدە).**

٤٦- ئەسورەتانەی قورئان کامەن کەبە(الر)دەست پێدەکەن؟

**و/ سورەتی (یونس،هود،یوسف،ئیبراهیم،حیجر).**

٤٧- درێژترین ئایەتی قورئان کامەیە؟

**و/ ئایەتی ٢٨٢ لەسورەتی ئەلبەقەرە،پێی دەگوترێ ئایەتی ئەلدەین(قەرز)** ﴿یاأیهاالذین ءامنوا إذا تداینتم بدین إلی أجل مسمی فاكتبوه.....﴾ **واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر قەرزێکتان کرد تاماوەیەکی دیاری کراو بینوسن.......**

٤٨- خوای گەورە خێرو شەڕی لەیەك ئایەتدا کۆکردۆتەوە ئەو ئایەتە چیە؟

**و/خوای گەورە دەفەرمووێ** ﴿إن ا یأمر بالعدل والإحسن و إیتای ذی القر وینهی عن الفحشاء والمنكر والبغي یعظكم لعلكم تذكرون﴾ **(النحل/٩٠) واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بەدادپەروەری وچاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بەخزمان، قەدەغە لەگوناه وتاوان و دەستدرێژی دەکات و ئامۆژگاریتان دەکات بۆئەوەی یادەوەری وەربگرن.**

٤٩-پڕ حیکمەت ترین ئایەتی قورئان کامەیە؟

**و/ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿فمن یعمل مثقال ذرة خ أ یره*ومن یعمل مثقال ذرة شراً یره﴾ **(الزلزله/٧-٨) واتە: جائەوەی بەقەدەر سەنگی**

**گەردیلەیەك خێرو چاكەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە، ئـەوەی بەقـەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت دەیبینێتەوە.**

**٥٠- گەورەترین ئایـەتی ئومێدبـەخش (الأعظـم فرَجـا)لـەقوڕئانی پیرۆز كامەیە؟**

**و/ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ 
**(الزمر/٥٣) واتە: ئەی پێغەمبەر(د.خ)پێیان بڵـێ خـودا دەفـەرموێت، ئەی بەندەكانم ئەوانەی كـەخۆتان گوناهبـار كـردوەو هەڵـەتان زۆرە، نائومێد مەبن لەڕەحمەتی خوا، چونكە بەڕاستی ئەگـەر ئێـوە تەوبـەی ڕاست ودروست بكەن.خوا لەهـەر هـەموو گونـاه وهەڵـەكانتان خـۆش دەبێـت چـونكە بێگومـان خـوا زۆر لێخۆشـبوو لێبووردەیـە و بەسـۆزو میهرەبانە.**

٥١- سـوڕەتێك لەسـوڕەتەكانی قوڕئـان لەمەدینـە دابـەزی لەسـاڵی نۆیــەمی كۆچــی، دوای جــەنگی تــەبوك، چــەند نــاوێكی هەیــە لەوانە(ئەلفاضیحە)چونكە دوو ڕووەكانی ئاشكرا كرد،ناوی چیە؟

**و/ سوڕەتی ئەلتەوبەیە.**

٥٥- ئایـە هۆیـەكی تایبـەت هەیـە بۆئـەوەی هەرئایـەتێكی قوڕئـان دابەزێ؟

**و/ نەخێر، بەڵکو زۆر لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەبێ هۆ دابەزیون.**

٥٦-سوودی زانینی هۆی دابەزینی ئایەت چی یە؟

**و/ بۆتێگەیشتنی ئایەتەکە سوودی هەیەو یارمەتیدەرە بۆشیکردنەوەی مانای ئایەتەکە.**

٥٧- سورەتی ئەلفاتیحە چەند وشەیە؟ژمارەی پیتەکانی چەندە؟

**و/ژمارەی وشەکانی سورەتی ئەلفاتیحە بیست وپێنج وشەیە،ژمارەی پیتەکانیشی سەدو سێزدە پیت.**

٥٨- بەرزو گەورەترین ترین ئایەتی قۆرئانی پیرۆز کامەیە؟

**و/ئایەتی ئەلکورسی** ﴿اُ لاإله إلاهو ا َي القَيوم لاتأخذُه سِنه ولا نوم لَه ما ِ السمواتِ وما ِ الأرضِ من ذا الذي يشفَع عِنده إلابِإذِنـهِ يعلَـم مابين أَيديهم وماخلْفَهم ولا يحِيطونَ بِشي ءٍ مِن عِلْمِهِ إلابِماشاءَ وسِـع كُرسِيه السمواتِ والأرض ولايؤده حِفظُهماوهو الْعلى العظيم﴾ **(البقره /٢٥٥) واته (خوازاتێکە جگە لەو هیچ خوایەکی ترنیە کەشایەنی پەرستن بێت و ئەوهەمیشە زیندووە و راگروسەر پەرشتیاری هەموو دروست کراوەکانیەتی، نەوە نەوزدەیگرێت ونەخەو، هەرچی لەئاسمانەکان وهەرچی لەزەویدا هەیە ئەوخاوەنیەتی کێ ئەوەی دەتوانێت تکابکات لەلای ئەو بەبێ مۆڵەتی خۆی دەشزانێت چی لەئێستاو داهاتو ورابردوودا رووی داوەو روودەدات، هیچ کام**

**لەدروستکراوەکانی زانست وزانیاری تەواویان نیە دەربارەی زانستەکانی ئەو.مەگەر خۆی بیەوێت فێریان بکات فەرمانرەوایی ودەسەلات و زانینی ئەوزاتە هەموو ئاسمانەکان وزەوی گرتۆتەوە و پارێزگاریان بەلای خواوە هیچ گران نیەو ئەو هەرخوایەکی بەرزو بلندو گەورەیە.**

٥٩- بەراوردکردن چیە لەنێوان ئەوەی کەخوای گەورە دەفەرموێ إنَ مثَلَ عیسى عِند ا ِ کمثَلِ آدم خلَقَه مِن ترابٍ ثُم قَـالَ لَـه کُـن فَیکُـونُ﴾ واتە: عیساش وەکو ئادەم بێ باوکە و خوای گەورە ئادەمی لەخاك دروستکردوەو گیانی پێ بەخشیوە؟

**و/ بەراوردکردنی ئەو ئایەتە توانای خوای گەورەیە لەدروست کردنی ئادەم(س)بێ باوك ودایك و عیساشی بەبێ باوك خولقاندوە.**

٦٠- یەکەم پەرستگا کەبۆخەلکی دروست کرابێت بۆ پەرستن کامەیە؟بەلگەت چیە؟

**و/یەکەم مالێ کە بۆ خوا پەرستن دانرابێ کەعبەیە لەمەککەی موکەرەمە،بەلگەش خوای گەورە دەفەرمووێ** ﴿إن أولَ بیـتٍ وضِـع ِللناسِ لَلذی ِبکةَ مبارکاً وهدى للْعالِ ﴾ **(ال عمران٩٦) واتە: یەکەم مەنزلگە کەبۆ خەلکی لەسەر زەوی بۆخواپەرستی، دانرا ئەوەیە لەمەککە دایە کەهیدایەتە بۆهەموو خەلکی جیهان .**

٦١- (الغلول) مانای چیه؟ بۆچی پێغەمبەرەکان لێی قەدەغەکراون؟ بەلگە چیە؟

**و/الغلول واتە: دزی کردن لەو غەنیمەتەی دوژمن جێیدەهێڵێ، پێش ئەوەی دابەش بکرێت و پێغەمبەرەکانیش لێی دوور کەوتونەتەوە لەبەر ئەوەی خیانەتە و بەڵگەش بۆ ئەوە خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿وماكانَ لِنَبِيٍّ أن يغل﴾ **(ال عمران/١٦١) واتە: هەندێك گومانیان برد کە پێغەمبەر(د.خ) لەدابەشکردنی دەسکەوتدا نادادی دەکات بێگومان بۆهیچ پێغەمبەرێك نەبووە کەخیانەت بکات.**

٦٢- وشەی(كَلاَلَة)لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە،مانای چیە؟

**و/ واتای(**كلالة**) ئەو کەسەی لەکاتی مردندا نە باوکی هەیەو نەکوڕ.**

٦٣- ئایائیبلیس مەلائیکەتە یا جنە؟

**و/لەجنەکانە.**

٦٤- بۆچی ئیبلیس سوجدەی بۆئادەم نەبرد؟لەبەر ئەوکارەی چ سزایەکی بۆهاتە خوارەوە؟

**و/ بەهۆی خۆبەگەورە زانینی و وای دەزانی کەئەو لەئادەم چاکترە.سزاکەشی ئەوە بوو خوای گەورە لەڕەحمەتی خۆی دەریکرد.**

٦٥- سورەتێك هەیە لەقورئانی پیرۆزبە(بسم الله الرحمن الرحیم)دەست پێناکات، ئەو سورەتە چیەو بۆچی بە(بسم

الله)دەست پێناکات؟

**و/ سورەتی ئەلتەوبەیە (براءة) کەبەناوی خوای گەورە دەستپێناکات، چونکە بەهەڵوەشاندنەوەی پەیمان وحاشاکردن لە کافرەکان دەستپێدەکات،ناوی خوای گەورەش ئەمانەتی تیایە.**

٦٦- دوای جەنگی بەدر ئایەتێکی قورئانی پیرۆز هاوڕابوو لەگەڵ بۆ چوونی عومەری کوڕی خەتاب ،ئەوئایەتە چیە؟

**و/خوای گەورە دەفەرمووێ** ﴿ماكانَ لِنبيٍ أنْ يكُونَ لَه أسرى حتى يثخن في الأرضِ تريدونَ عرض الدنيا والله يريد الاخرةَ والله عزيز حكيم* لَولا كِتب مِن الله سبق لَمسكُم فِيما أخذتم عذاب عظيم﴾ **(الانفال٦٧-٦٨)**

**بۆهیچ پێغەمبەرێك نەبووە کەدیلی هەبێت، هەتا کاتێك چاك پایەدارو جێگیر دەبێت لەزەویدا، مەگەر کەل وپەل و شتومەکی دونیاتان دەوێت؟لەکاتێکدا خوا سەرفرازی ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە وخوا بالا دەست دانایەو خۆئەگەر بڕیارێك لەلایەن خواوە پێش نەکەوتایە لەسەر ئەوشتانەی کەوەرتان گرت لەبەرامبەر ئازادکرنی دیلەکانەوە، ئەوە سزایەکی زۆر گەورەتان تووش دەبوو.**

# سەربردەی پێغەمبەران

٦٧- بۆچی ئیبراهیم ئەلخەلیل بەباوکی پێغەمبەران ناونراوە؟

**و/ لەبەر ئەوەی زۆربەی پێغەمبەرەکان وەکو ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، داود، سولەیمان، لەنەوەی ئەون خوا لێیان رازی بێ.**

٦٨- کێ یەکەم نێردراوە(رسول)ە کەبۆ مرۆڤایەتی نێردراوە؟

**و/نوح سەلامی خوای لێ بێ.**

٦٩- نوح چەند ساڵ لەلای قەومەکەی مایەوە؟بەلگە چیە؟

**و/نوح نۆسەدو پەنجا ساڵ لای قەومەکەی مایەوە،بەڵگەش خوای گەورە دەفەرمووێ** ﴿ولَقَد أرسلْنا نوحاً إ قَومِهِ فَلَبِثَ فِيهم ألْف سنةٍ إلا خمس عاماً﴾ **(العنكبوت /١٤) واتە:ئێمە نوح مان ڕەوانە کرد بۆسەر قەوم وهۆزەکەی، هەزار ساڵ پەنجا کەم لەناویاندا مایەوە.**

٧٠- ،بەلگەی ئەوە چیە لەقورئانی پیرۆز ئیبراهیم ئەلخەلیل پیاوێکی چاوتێر بوو ؟

**و/بەڵگە ئایەتی ٢٦لەسورەتی (الذاريات)کەخوای گەورە دەفەرمووێ** ﴿فَراغَ إلَى أهلِهِ فَجاءَ بِعِجلٍ سمِينٍ﴾ **واتە: ئەوسا خۆی دزیەوە چوو بەهاوکاری خێزانی گوێرەکە یەکی قەلەوی (سەربری وسوورکردەوە)و هێنای.**

**٧١- هـۆی چـی بـوو کورەکـانی یـەعقوب رقیـان لەیوسـفی برایـان دەبووەوە؟**

**و/هۆیەکەی ئیرەیی (حەسودی بوو).**

**٧٢- ئایا برایەکانی یوسف پێغەمبەر بوون؟**

**و/نەخێر پێغەمبەر نەبوون.**

**٧٣- خـوای گـەورە لەسـورەتی ئەلبەقـەرە ئایـەتی ٢٤٨دەفـەرموێ** وقالَ لَهم نبيهم إنَ ءَايةَ ملْكِهِ أن يأتيكم التا بوت ِفِيهِ سكينةٌ مِّن ربِكُم وبقيةٌ ِمما ترك ءَالُ موسى وءَالُ هرونَ تحمِلُه الْملآئِكةُ إن ِ ذِلك لأيِ ـةً لَكُم إن كُنتم مؤمِن ﴾ **واتـە: (ئەوسا پێغەمبەرەکـەیان پـێ ی وتـن بەراسـتی نیـشانەی پاشـایەتی تـالوت ئەوەیـە ، سـندوقەکەتان بـۆ دێتـەوە وئاسـودەیی و ئـارامی تێدایـە لەلایـەن پەروەردگارتانـەوە هـەروەها هەنـدێك پاشمـاوەی بـەنرخ و کەلـەپوری تێدایـە لـەوەی کەبنەماڵـەی موسـاو بنەماڵـەی هـارون بـەجێیان هێـشتووەو لـە کاتێکدا فریشتە دەیهێننەوە بۆتان بەراسـتی ئـەوە بەڵگـەی تـەواوە بۆتان ئەگەر باوەڕدارن) ئەوەی کە ئالی هارون بـە جێیـان هێـشتوە چی یە ؟**

**و/ئەوەی کەلەدوای ئالی موساو ئـالی هـارون بـەجێماوە، دارەکـەی موساو نەعلەکانی و هەندێ تەختە.**

٧٤-ئەوئایەتە پیرۆزە چیە کەپێغەمبەر(د.خ)رۆژی ڕزگارکردنی مەککە کاتێ بتەکانی دەورەی کەعبەی دەشکاند دەیخوێندەوە ؟

**و/ ئایەتی ٨١ لەسورەتی الاسراء** ﴿وقُلْ جاءَ ا َق وزهـ ـق الباط ـ لُ إنَ الباطِلَ كَانَ زهوقاً﴾ **واتە: تازە ئیتر حەق وڕاستی بەرپابووەو هاتووەو ناهەقی پوچ وتەفروتونا، بووە بەڕاستی ناحەق وبەتاڵ هەر تیا چووەو بەزیوە، پێغەمبەر(د.خ)دار عەصای بەدەستەوە بوو بتەکانی پێدەشکاندوو ئایەتەکەی دەخوێندەوە.**

٧٥- خوای گەورە لەسەر زمانی یەکێك لە پێغەمبەران فەرمویەتی ﴿قَالَ كَلا إن مِعِى ر سيهدينِ﴾ (الشعراء ٦٢) واتە: نەخێر وانیە من بەڕاستی پەروەردگارم لەگەڵدایەو ڕێنمونیم دەکات (بۆڕزگاری وسەرفرازی)ئەو پێغەمبەرە کێیە؟

**و/ئەو پێغەمبەرە حەزرەتی موسایە(س).**

٧٦-خوای گەورە لەسەر زمانی یەکێك لەپێغەمبەرەکانی فەرموویەتی ﴿لا تحزنْ إنَ ا َ معنا﴾ (التوبه/٤٠)

واتە: خەفەت مەخۆ دلنیابە خوامان لەگەڵە؟ ئەو پێغەمبەرە کامەیە؟بۆچی وای گوتووە؟

**و/پێغەمبەرمان موحەممەدە(د.خ)، لەشەوی کۆچ کردن بۆ مەدینەی مونەوەرە ئەوەی بە ئەبوبەکری سدیق گوتوە، کاتێك کافرەکان دەوریان**

**گرتبون لەئەشکەوتی (ثور) و ئەبوبەکر خەمی لێهات.**

٧٧- ئەو پێغەمبەرەی قەومەکەی بەگومڕا تاوانباریان کرد کێیە؟

**و/ پێغەمبەر نوحە،کەخوای گەورە دەفـەرموێ** ﴿قَالَ يَقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ **(الاعراف٦١) واتە: نوح ووتی:ئەی قەوم وهۆزم، من هیچ گومراییەکم نییە، بەڵکو مـن پێغەمبـەرێکم و لەلایـەن پەروەردگاری جیهانەوە ڕەوانە کراوم.**

٧٨- خـوای گـەورە دوو پێغەمبـەری بەیەکـەوە نـارد، بۆبانگـەواز کردنـی یـەکێ لەپاشـایەکان بـۆدینی خـوا، ئـەو دوو پێغەمبـەرە کێن؟ئەو پاشایە کێیە؟

**و/ئەو دوو پێغەمبەرە موساو برایەکەیەتی کە هارونە، سـەلامی خوایـان لێبێ،خوای گەورە بۆلای فیرعەونی ناردن خوای گەورە لەسورەتی(طه) ئایەتی ٤٣دەفەرموێ** ﴿ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ .

**واتە: هەردووکتان بڕۆنە لای فیرعەون چونکە ئەو لەمـەرزی بەندایـەتی دەرچووە.**

٧٩- چەند جارناوی ئادەم باوکی مرۆڤ، لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/نـاوی ئـادەم (٢٥)جـار لەقورئانـدا هـاتووە ئـەویش لەسـورەتی (ئەلبەقەرە، ئال عیمران، ئەلمائیدە، ئەلئەعراف، ئەلئیسراء، ئەلکـەهف، مریەم، طه، یس).**

٨٠- چەند جار ناوی پێغەمبەری خوا ئیدریس لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ناوی ئیدریس پێغەمبەری خوا دوو جار لەقورئاندا هاتووە، جارێکیان لەسورەتی مەریەم و جارێکیشیان لەسورەتی ئەلئەنبیاء .**

٨١- ناوی(نوح)(ع) سەلامی خوای لێبێ، چەندجار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(٤٣)جار لەقورئاندا هاتووە لە(٢٨)سورەتدا.**

٨٢- هود(ع) پێغەمبەری خوا، چەندجار ناوی لەقورئاندا هاتووە؟

**و/ حەوت جار ناوی لەقورئاندا هاتووە لەسێ سورەتدا ئەوانیش (ئەلئەعراف، هود، ئەلشوعەراء )**

٨٣- یەکەم پێغەمبەر کە بەزمانی عەرەبی قسەیپێ کردووە کامەیە؟ بانگەوازەکەی لەکوێ بوو؟

**و/ پێغەمبەری خوا هودبوو،لەناوچەی باکوری حەزرەموت کەلە عومان نزیکە، لەدورگەی عەرەبی بانگەوازی دەکرد.**

٨٤- پێغەمبەری خوا(صالح)چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ نۆ جار ناوی لەقورئانداهاتووە لەچوار سورەتدا، ئەوانیش (ئەلئەعراف، هود، ئەلشوعەراء ، ئەلنەمل)**

٨٥- ناوی ئەومیللەتە چیە، خوای گەورە پێغەمبەری خوا(صالح)ی

نارد؟و لەکوێ دەژیان؟

**و/ئەو میللەتەی کەخوای گەورە صالحی(ع) بۆ نارد، میللـەتی ئـەمود بوون و لەچیاکان دەژین،لـەوێش خانوەکـانی خۆیـان دروسـتکردوە لەناوچەی نێوان حیجازوشام،دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی عەقەبـە لـەئوردون و خانووەکانیان تائەو ڕۆژگارەش هەرماوە.**

٨٦- پێغەمبەری خوا ئیبراهیم (ع)لەکوێ لەدایك بووە؟

**و/لەباشوری عێراق لەدایك بووە.**

٨٧- ئەو وولاتەی ئیبراهیم پێیدا ڕۆیشت، لەکاتی بانگەوازەکەیدا چ وولاتێك بوو؟

**و/ئیبراهیم(ع)لەعێراق چوو بۆشام، دوای ئەوە چووە فەلـستین و دوای ئەوەش چووە میسرو دوایی چووە مەککە لەدورگەی عەرەبی.**

٨٨- ئیبراهیمی(ع)پێغەمبەری خوا لەکوێ کۆچی دوایی کرد؟

**و/لەشاری ئەلخەلیل لە فەلەستین کۆچی دوایی کرد.**

٨٩- ئیبراهیم(ع)چەند جارناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ (٦٩)جار ناوی لەقورئاندا هاتووە لە(٢٥)سورەتدا.**

٩٠- ئـەو پێغەمبـەرە کێیـە کـەهاو کـات لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ئیبراهیم نێردرا؟

**و/پێغەمبەری خوا لوط(ع)بوو، کە برازای ئیبراهیمە.**

٩١- پێغەمبەری خوا لوط(ع)چەند جارناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ ٢٧جار ناوی لەقورئاندا هاتووە لە(١٤)سورەتدا.**

٩٢- ئيسحاق(ع) پێغەمبەری خوا چەند جارناوی لەقورئانی پيرۆزدا هاتووە؟

**و/ (١٧) جارناوی لەقورئاندا هاتووە لە(١٢)سورەتدا.**

٩٣- يەعقوب(ع) پێغەمبەری خوا چەند جار ناوی لەقورئانی پيرۆزدا هاتووە؟

**و/يەعقوبی پێغەمبەری خوا(١٦)جار ناوی لەقورئاندا هاتووە لە (١٠)سورەتدا.**

٩٤- ئيسماعيلی(ع)پێغەمبەری خوا چەند جارناوی لەقورئانی پيرۆزدا هاتووە؟

**و/خوای گەورە لەقورئانی پيرۆز(١٠)جار ناوی ئيسماعيلی هێناوە لە (٨)سورەتدا.**

٩٥- ئەو پێغەمبەرەی پێی دەگوترێ قوربانی کێيە؟

**و/ئيسماعيلی پێغەمبەری خوا بوو،بۆيەش بەقوربانی ناونراوە، چونکە خوای گەورە فەرمانی بەئيبراهيم(ع)کرد کەسەری کوڕی ببڕێ،دوای ئەوە خوای گەورە مەڕێکی نارد بۆئەوەی سەری ببڕێ.**

٩٦- يوسفی(ع)پێغەمبەری خوا، چەند جارناوی لەقورئانی پيرۆزدا

هاتووە؟

**و/ (٢٧)جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە، لە(٣)سورەتدا ئەوانیش (ئەلئەنعام، یوسف، غافر).**

٩٧- شوعەیبی پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(١١)جارناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە لە(٤)سورەتدا ئەوانیش (ئەلئەعراف، هود، ئەلشوعەراء ،ئەلعەنکەبوت).**

٩٨-ووشەی(ئەصحابولئەیکە)لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە، (ئەلئەیکە) مانای چیە؟لەکوێیە؟

**و/ مانای داری نەرم ونیان، جێگاشی نزیکی تەبوکە لەدورگەی عەرەبی.**

٩٩- موسای(ع)پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(١٣٦)جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە لە (٣٤)سورەتدا.**

١٠٠- هارونی(ع)پێغەمبەری خوا، چەند جارناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ (٢٠)جار ناوی لەقورئاندا هاتووە لە(١٣)سورەتدا.**

١٠١- ئیلیاسی(ع)پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقورئانی

پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ دووجار ناوی لەقورئاندا هاتووە لەسورەتی ئەلئەنعام و ئەلصافات.**

١٠٢- ئەلیەسع(ع)ی پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ دوو جارناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە لەسورەتی ئەلئەنعام وموحەممەد**

١٠٣- داود(ع) پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(١٦)جارناوی لەقورئاندا هاتووە لە(٩)سورەتدا.**

١٠٤- سولەیمان(ع) پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(١٧)جارناوی لەقورئاندا هاتووە لە(٧)سورەتدا.**

١٠٥- ئەیوب(ع) پێغەمبەری خوا چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(٤)جار لە(٤)سورەت ناوی لە قورئاندا هاتووە ئەوانیش (ئەلبەقەرە، ئەلئەنعام، ئەلئەنبیاء، صاد﴾ .**

١٠٦- ئەیوب(ع)پێغەمبەری خوا لەکوێ ژیاوە؟

**و/لەشام لەنێوان دیمەشق وئەزرەعات، ئێستا بە (درعا)ناسراوە لەباشوری دیمەشقە.**

١٠٧- زولکیفل(ع) پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقوڕئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/دوو جارناوی هاتووە لەسوڕەتی ئەلئەنبیاء و موحەممەد دا.**

١٠٨- یونس(ع) پێغەمبەری خوا چەند جار ناوی لەقوڕئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(٤)جار ناوی لەقوڕئاندا هاتووە لە(٤)سوڕەتدا، ئەوانیش (ئەلنیساء ، ئەلئەنعام، یونس، ئەلصافات).**

١٠٩- زەکەریا(ع) پێغەمبەری خوا، چەند جار ناوی لەقوڕئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/(٧)جار ناوی لەقوڕئاندا هاتووە لە(٤)سوڕەت، ئەوانیش (ئالی عیمران،ئەلئەنعام،مەریەم،ئەلئەنبیاء).**

١١٠- یەحیا(ع) پێغەمبەری خوا چەند جار ناوی لەقوڕئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ (٥)جارناوی لەقوڕئاندا هاتووە لە(٤)سوڕەتدا، ئەوانیش (ئالی عیمران، ئەلئەنعام، مەریەم، ئەلئەنبیاء).**

١١١- عیسا(ع) پێغەمبەری خوا چەند جار ناوی لەقوڕئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/ (٢٥)جارناوی لەقوڕئاندا هاتووەو مەسیحیش(١١)جارو کوڕی**

**مەریەم(٢٣)جار.**

١١٢- لوقمان(ع) چەند جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

**و/لوقمان(ع) دووجار ناوی لەقورئاندا هاتووە لەسورەتی لوقمان.**

١١٣- ٢ حەکیم لەکوێ ژیاوە؟

**و/لەنەوبە کەلەسەر رووباری نیلە لەسودان.**

١١٤-ئایا لوقمان پێغەمبەر بوو؟

**و/نەخێر پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو پیاوێکی زانا بووە.**

١١٥- میللـەتی عادلەناوچـەیەك ژیـاون پێـی دەوتـرێ ﴿إرم ذات العماد﴾ ئەم ناوچەیە کەوتۆتە کام جێگا و لەچ سورەتێکدا نـاوی هاتووە؟

**و/ ﴿إرم ذات العماد﴾ لەیەمەنە لەنێوان حـەزرە مـەوت وصـەنعاء دا، لەسورەتی ئەلفەجر ناوی هاتووە لەئایەتی (١٦٨).**

١١٦- ئەصـحابولرەس ناویـان لەقورئانـدا هـاتووە،رەس واتـای چـیە چەندجار ناویان لەقورئاندا هاتووە؟جێگایان لەکوێ یە؟

**و/ئەلرەس: ئەو بـیرە، کەبەبـەرد پڕکرابێتـەوە،گوتراوە کەئـەو میللتـە پێغەمبەری خۆیان هاوێشتۆتە ناوبیرو دووجار ناویان لەقورئانی پـیرۆزدا هاتووە لەسورەتی ئەلفورقان و سـورەتی ق،جێگاشـیان لەیەیامەیـە لـە رۆژهەڵاتی دورگەی عەرەبی.**

١١٧- میللـەتی (توبـەع) چـەند جـار ناویـان لـەقورئانی پـیرۆزدا

هاتووە؟ (توبەع) کێیە؟لەکوێ ژیاوە؟

**و/میللەتی توبەع دوو جار ناویان لەقورئاندا هاتووە، توبەعیش: ناوی پاشایەکە لەپاشاکانی یەمەن لەسەدەی دەیەمی پێش زایینی لەیەمەن ژیاوە،چەند جێگایەکی ڕزگار کردوە تاگەیشتۆتە سەمەر قەند،یەکەم کەسیشە کەبەرگی لەبەر کەعبە کردبێ.**

١١٨- ئەصحابولجەنە ناویان لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە لەکوێ ژیاون؟

**و/ لەیەمەن ژیاون لەنزیك، صەنعاء .**

١١٩- ئەصحابولفیل ناویان لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە پاشایەکەیان ناوی چیە؟لەکوێ ژیاوە؟بۆچی هێرشی کردە سەر کەعبە؟

**و/ناوی پاشایەکەیان:ئەبرەهەی کوڕی ئەشرەمی حەبەشیەو حوکمی یەمەنی کردووە لەساڵی ٥٧١ی زایینی ،لەگەڵ سوپاکەی بۆ کەعبە چوو، بۆئەوەی وێرانی بکا. کەنیسەی ئەلقولەیسی لەصەنعا، دروست کرد، بۆئەوەی عەرەبەکان حەجی بۆ بکەن، لەجیاتی ئەوەی بۆحەج کردن بچنە کەعبەی پیرۆز.**

١٢٠- کاتێ ئەبرەهە ی حەبەشی خۆی و سوپاکەی گەیشتنە مەککە، پارەی عەرەبەکانیان بردو بەیەکگەیشتنێك هەبوو لەنێوان ئەو و عەبدولموتەلیبی باپیری پێغەمبەر(د.خ)گفتوگۆیەك

لەنێوانیاندا ڕوویدا، چ دەزانی لەوەی کەلەنێوانیاندا ڕوویدا؟

**و/عەبدولموتەلیبی باپیری پێغەمبەر(د.خ)هاتە لای ئەبرەهەو داوای لێکرد کەحوشترەکانی بداتەوە کەسوپای ئەبرەهە بردبویان، ئەبرەهە سەری سوڕما و بەعەبدولموتەلیبی گوت:داوای ئەو دووسەد حوشترەم لێدەکەی کەبردبووم بەیتیش لێدەگەڕێی، کەئایینی خۆتە و ئایینی بابو باپیرانتە و منیش هاتوم بیڕوخێنم باسی ناکەی؟! عەبدولمەتەلیب گوتی:من خاوەنی حوشترەکانم، هەرچی بەیتیشە ئەوا خوای گەورە خاوەنیەتی، دوای ئەوە خوای گەورە باڵندەی ئەبابیلی نارد، کۆمەڵ کۆمەڵ هەر هەندێکی دوای ئەوی تر بەردی پێدادان، کەلەقوڕێکی ڕەقبووەوە پێکهاتبوو وەکو گەڵای ووشکبوەوەی لێکردن.**

١٢١- لەسورەتی قوڕیشدا باسی گەشتی زستانەو گەشتی هاوینە کراوە گەشتی زستانە بۆکوێ بوو؟گەشتی هاوینە بۆکوێ بوو؟

**و/سەرۆکەکانی قورەیش گەشتی زستانەیان بۆیەمەن و حەبەشە بوو هەرچی گەشتی هاوینەشە بۆ وولاتی شام وعێراق بوو.**

١٢٢- لەقورئانی پیرۆزدا باسی (طوری سینین) کراوە،لەکوێیە؟

**و/ سینین واتە سیناء دەکەوێتە سیناء لەمیسر.**

١٢٣- خوای گەورە لەسورەتی ئەلزوخرف ئایەتی(٣١)دەفەرمووێ ﴿وقَالواْ لَولا نزّلَ هذا القُرءَانُ علَى رجل مِّن القَريَتَين عظِيم﴾ واتە: هەروەها بیانوویان گرت ووتیان ئەوە بۆئەم قورئانە دانە بەزێنرا،

بۆسەر پیاوێکی گەورە لەپیاوە گەورەکانی دوو شارەکە؟مەبەستی چیە لەدوو گوندەکەو؟مەبەستی کامە پیاوە؟

**و/ دوو گوندەکە: مەککەو تائیفە،ئەو دووپیاوەی لەو ئایەتە باسی دەکا: ئەلوەلید ئەلمەخزومیو عروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی بوو، قورەیشیەکان بەخراپە باسی پێغەمبەر(د.خ)یان دەکرد، ئەو پیاوێکی نەدارو هەتیوە،گوتیان با خوای گەورە قورئان بۆ یەکێك لەسەرۆکە گەورەکانمان دابەزێنێ ،وایان زانی ئەو کەسەی ماڵ وسامانی زۆر بێ ئەو گەورەیە نەیانزانی ئەوکەسەی لەلای خوای گەورە گەورەبێ ئەو گەورەیە، وەلیدی کوڕی موغیرە ئەو کات، گەورەی میللەتەکەی خۆی بوو لەتائیف .**

١٢٤- خوای گەورە لەسورەتی ئەلتەوبە ئایەتی ١٠٨دا دەفەرمووێ ﴿لاتقُم فيِه أبداً  سجِد ٌأسِس علَى التقْوى مِن أول يومِ أحق أن تقُوم فِيِه فِيِه رِجالٌ يحِبونَ أن يتطهروا وا   يحِب ا ُلمطهرين﴾ واتە: هەرگیز لەو مزگەوتە مەوەستە بۆ نوێژکردن بەڕاستی مزگەوتێك شایستەیە کەتۆ نوێژی لێ بکەیت کەهەر لەیەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنچینەی تەقوا دروست کرابێ چونکە لەومزگەوتەدا چەند کەسێکی مەردی تێدایە زۆر حەز دەکەن خۆیان خاوێن ڕابگرن خواش ئەوانەی خۆش دەوێت ناوی ئەومزگەوتەی کەلەسەر تەقوا بنیات نراوە

چیە؟

**و/مزگەوتی قوباء لەنزیك مەدینەی مونەوەرەیـە، ئـەو مزگەوتەیـە کـە لەسەر تەقوا بنیات نراوە، یەکەم مزگەوتە لەئیسلامدا دروست کرابێ.**

١٢٥- خوای گەورە لەسورەتی ئەلقەصەص ئایەتی(٩)دا دەفـەمووێت وقالَت أمرأت فِرعونَ قُرت ع ـِ ـِ ولَك لاتقْتلوه عسى أن ينفَعنا ولَداً وهم لا يـ ـشعرونَ﴾ واتـە: خێزانەکـەی فیرعـون نەیهێـشت و وتـی: هیـوادارم ببێتــە مایــەی خۆشــحاڵی مــن وتــۆ مــەیکوژن، بــەڵکو لەئایندەدا سوودمان پێ بگەیـەنێت، یـان دەیکەینـە کـوری خۆمـان لەکاتێکـدا ئـەوان هەسـت ناکـەن.مەبەسـت لـەو ئایەتـەدا کوشـتنی کێیە؟خێزانی فیرعەون ناوی چیە؟

**و/مەبەست لەوئایەتـەدا کوشـتنی پێغەمبـەری خواموسـایە(ع)، نـاوی خێزانی فیرعەونیش ئاسیەی کچی موزاحیمە.**

١٢٦- خوای گەورە لەسورەتی(**طه**)لە ئایـەتی(٨٥)دا دەفـەرموێ: (قَالَ فَإنا قَد فَتنا قَومك مِن بعدِك وأضلهم الـ ـسامِری﴾ واتـە: پـەروەردگار فەرموی:ئێمە قەومەکەتمان لەدوای هـاتنی تـۆ تاقیکردەوە،کـابرای سامیری گومڕای کردن.ئەلسامڕی کێیە؟

**و/ئەلسامری: خۆی لەبنەڕەتدا خەڵکی گوندی باجرمایە نزیـك شـاری ئەلڕەقە لەسوریا لەسەر ڕوباری فوڕات، چووە میسر دوای ئەوەش چـووە**

**ســـــیناء ،ئـــــەویش ســــاحیرێکی دوو ڕووە لەمیللـــــەتێکی چـــــێڵ پەرستە،ئەوکاتەی موسـا لـەناو قەومەکـەی نەبوو،سـامیری گەوهـەری کۆکردەوەو گوێرەکەیەکی لێ دروست کرد داوای لێکردن بیپەرستن.**

١٢٧- ﴿ٱلَّـذِى حَـاجَّ إِبۡـرَاهِيمَ فِى رَبِّـهِۦٓ﴾ کەلەسوڕەتی ئەلبەقـەرە ئایەتی(٢٥٨)دا هاتووە کێ یە ؟

**و/نەمرودی کوڕی کەنعان.**

١٢٨- خـوای گـەورە لەسـوڕەتی ئەلومجادلـە ئایـەتی ١ فەرموویـەتی: ﴿قَدۡ سَمِعَ اللهُ قَوۡلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى اللهِ وَاللهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ واتە: ئەی موحەمـەد خـوا بیستی و تووێژی ئەوئافرەتەی گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربـارەی هاوسەرەکەی، سکاڵای خۆشی بۆ لای خوا دەبات، خوایش گـوێی لـە گفتوگۆکەتان بوو بەراستی خوا بیسەرەو دەبینێـت . ئـەو ئافرەتـە کێیە ؟

**و/ خەولەی کچی ثـەعلەبەیە،خوای گەورە لەسەروی حەوت ئاسمانــەوە گوێی لەگازاندەی بوو.**

١٢٩- خوای گەورە فەموویەتی ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ﴾ واتە: ڕووی گرژکــردو ڕووی وەرگێــڕا لەبــەر ئــەوەی نابیناکــە هــات بۆلای.گلەیی لەپێغەمبـەر(د.خ)کـرد لەبەرئـەوەی خـۆی لـەوکوێرە

بـــەدوور گرتبوو،کوێرەکـــە کێیـــە؟هۆی خـــۆلێ بـــەدوورگرتنی پێغەمبەر(د.خ)چیە لەو پیاوە کوێرە؟

**و/ناوی پیـاوە کوێرەکـە:عەبـدووڵای کـوڕی ئـوم مەکتومە،هاتـەلای پێغەمبەر(د.خ)و پێی گوت فێری ئەوەم بکـە کـەخوای گـەورە فێـری کردویت،دووبارەشی کردەوە،نەشیزانی کە پێغەمبـەری خـوا بەهەنـدێ لەگەورەکانی قوڕەیش سەرقاڵە، بۆیـە پێغەمبـەر(د.خ)پـشتی تێکـردو پێناخۆش بوو، کەپیاوە کوێرەکە قسەی ئـەوی بڕیوە،جـاخوای گـەورە گلەیی لەپێغەمبەر(د.خ)کرد لەبەر ئەوکارە.**

١٣٠- خـوای گـەورە لەسـوڕەتی ئەلتەوبـە ئایـەتی(٤٩)دا دەفـەرموێ ﴿ومِنهم من يقولُ ائذَن لّى ولاتفۡتِنى ألا ـ الفِتنةِ سـ ـقَطواْ وإن جهـ ـنم لَمحِيطةُ ـبِالۡكفِرين﴾ واتە: لەوانە کەسانێك هەن دەڵێن مۆڵەتم بـدەو توشـی گونـاه وسەرپێـچیم مەکـە، لەحالێکـدا ئـەو جـۆرە کەسـانە باچاك بزانن، کەلەتاواندا ڕۆچوون، بێگومان دۆزەخـیش گـەمارۆی بـێ بـاوەڕانی داوەو ڕزگاربونیـان ئەسـتەمە، مەبەسـت لەوئایەتـە چیە؟

**و/مەبەست لەو ئایەتە ئەلجەدو کوڕی قەیـسە کـە دوو ڕوو بـوو کـاتێ پێغەمبـــەر(د.ح)بـــانگی کـــرد لەجـــەنگی تـــەبوك ووتـــی:ئـــەی پێغەمبەر(د.خ)ی خوا مۆڵەتم بدە بانەیەمە جەنگ چونکە مـن دەترسـم ئەو ئافرەتە جوانانەی بەنی ئەلئەصفەر ببینم و دڵم بۆیان بچێ.**

**١٣١- پێغەمبەرێك ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە خوای گەورە سوێندی بەژیانی ئەو پێغەمبەرە خواردوە بۆرێزلێنان وگەورەیی، ئەو پێغەمبەرە کێیە؟ ئەو ئایەتەش کامەیە؟**

**و/موحەممەدە(د.خ)،ئەوەش کەخوای گەورە دەفەرموێ** ﴿لَعمرك إنهم لَفى سكْرتِهِم يعمهونَ﴾ **(الحجر٧٢) ئەی موحەممەد(د.خ)،سوێند بەگیانی تۆ ئەوانە لەسەرخۆشی خۆیاندا بۆ گوناه و سەر گەردەنیاندا دەتلێنەوە**

**١٣٢- لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە کەپێغەمبەرێك لەوە دەترسا کەخەڵکی حەسودی بەمناڵەکانی ببەن بۆیە ئامۆژگاریانی کرد،ئەوپێغەمبەرە کێیە؟ ئامۆژگارییەکەی چیە؟ لەچ ئایەتێك لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئەم باسە کراوە؟**

**و/پێغەمبەرەکە یەعقوبە(ع)، ئامۆژگاریەکەشی ئەوە بوو کەلەیەك دەرگا نەچنە ژوورەوە،ئایەتەکەش** ﴿وقَالَ يبِ لاتدخلُوا مِن بابٍ واحِدٍ وادخلُوا مِن أَبوبٍ متفرِّقَةٍ وما أُغ عنكُم مِّن ا مِن شيءٍ إِن الْحكْم إِلا لِلهِ علَيهِ توكَّلْت وعلَيهِ فَلْيتوكل الْمُتوكِّلونَ﴾ **(یوسف/٦٧) واتە: وتی: کوڕەکانم هەمووتان لەیەك دەروازەوە مەچنە ژوورەوە و لەچەند دەروازەیەکی جیاجیاوە بچنە ژوورەوە، دڵنیاش بن کەمن ناتوانم هیچ شتێك لەو بەڵاو پێشهاتانەی کەبریاری خوای لەسەرە بگێڕمەوە**

**لەئێوە،هیچ فەرمان وبریارێك بۆكەس نیە تەنها بۆخوا نەبێت، پشتم هەربەو بەستوەو دەبا ئەوانەی پاڵپشت وپشتیوانیان دەوێت هەرپشت بەو ببەستن.**

١٣٣- خوای گەورە پێغەمبەرەكانی بەتوندترین شێوە تاقی كردۆتەوە، ئەوانەی دوای پێغەمبەرەكانیشی تاقی كردۆتەوە، خوای گەورە چۆن ئادەم(ع)ی تاقیكردۆتەوە؟

**و/خوای گەورە فەرمانی پێكرد، كەلەبەری دارێكی دیاری كراو نەخوات،ئادەم(س)یش لێی خواردو خوای گەورە دایبەزاند بۆسەر زەوی.**

١٣٤- خوای گەورە ئەیوب(ع)بەچ شێوەیەك تاقیكردتەوە؟

**و/بەو جۆرە خوای گەورە ئەیوب(س)ی تاقیكردۆتەوە، تووشی نەخۆشیەكی زۆر توند بووە، تەنیا هێسك وپێستەكەی ماوە و ماڵ و منداڵەكەی وچاویشی لەدەست داوە بەڵام ئەو بۆماوەیەكی دوورو درێژ سەبری گرتوە.**

١٣٥- خوای گەورە چۆن ئیبراهیم(س)ی تاقیكردۆتەوە؟

**و/خوای گەورە ئەمری پێكردووە، كەتاقە كوڕەكەی خۆی سەرببڕێت، ئەویش ئارامی گرت وقسەی خوای بەجێ گەیاند، خوای گەورەش لەجیاتی ئەو قوربانیەكی نارد بۆئەوەی سەری ببڕێ و ئیسماعیلیش بەسەلامەتی دەرچوو.**

١٣٦- خوای گەورە چۆن زەکەریای بەتەنیایی تاقیکردۆتەوە؟

**و/خوای گەورە زەکەریا(ع)ی بەتەنیایی تاقیکردۆتەوە، کەتەمەنی زۆر گەورەببوو خێزانەکەی منداڵی نەدەبوو، جالەخوای گەورە پاڕاوە کەکوڕێکی پێ ببەخشێ خوای گەورە یەحیا(ع)ی پێ بەخشی.**

١٣٧- خوای گەورە چۆن یەعقوب(ع)ی تاقی کردۆتەوە؟

**و/خوای گەورە یەعقوب(ع)ی بەلەدەستدانی یوسفی کوڕی تاقیکردۆتەوە، کاتێ برایەکانی خستیانە نێو بیرێکەوە و یەعقوبیش بۆماوەیەکی دوورو درێژ ئارامی گرت تائەو کاتەی خوای گەورە هەموویانی کۆکردەوە.**

١٣٨- خوای گەورە چۆن موسا(ع)ی تاقیکردۆتەوە؟

**و/خوای گەورە موسای تاقیکردەوە بەپێگیریکردنی میللەتەکەی وپێگیری کردنی فیرعەون وهەروەها هەوڵی کوشتنی، هەروەها موسا زۆر ترسا کاتێ بەبێ ویستی خۆی بەهەڵە پیاوێکی کوشت وئەوەش وای لێکرد کە وڵاتی خۆی جێبهێڵێ بۆ ئەوەی لەدەستی کەس وکاری کوژراوەکە ڕزگاری بێت.**

١٣٩- خوای گەورە چۆن نوح(ع)ی تاقیکردەوە؟

**و/خوای گەورە نوح(ع)ی تاقیکردەوە بەپێگیرکردنی میللەتەکەی و رازی نەبونیان بەبانگەوازی ئەو، لەگەڵ ئەوەی(٩٥٠)ساڵ لایان مایەوە،**

**بڕوایان نەهێنا چەند کەسێکی کەم نەبێ تاوای لێهات توشی نائومێدی بوو، هەروەها کوڕەکـەی و خێزانەکەشـی لـەڕیزی کافرەکـان بـوون، کەبڕوایان بەبانگەوازی ئەو نەکرد.**

١٤٠-خوای گەورە یونس(ع)ی چۆن تاقیکردەوە؟

**و/خوای گەورە یونس(ع)ی بەجۆرێك تاقیکردەوە، ئەمری بە نەهـەنگ کرد کەقووتی بدات،لەسزای ئەوەی لەمیللەتەکەی خـۆی نائومێـد بـوو جێیانی هێـشت، چـل ڕۆژ بەخـەمێکی زۆر لـەناوی سـکی نەهەنگـدا مایەوە، دوای ئەوە یادی خوای کرد خوای گـەورەش ڕزگـاری کـردو نەهەنگەکە فڕێی دایە نادەرەوەی ڕوبارەکە.**

١٤١-خوای گەورە دوعای پێغەمبەرەکانی خۆی قـەبول کـرد، دوعـای یونس(ع)چی بوو؟

**و/دوعای یونس(ع)** ﴿وذا النون إذ ذَهب مغاضِباً فَظَن أن لن نقْدِر علَيهِ فَنادى ـ الظلُماتِ أن لآإا ـه إلاَأنـ ت سـ بحانك إنـ ى كُنـ ت ـِ ـ ن الظاِ *فَاستجبنا له ونجينه مِن الغـ ـمّ وكَـ ذَِلك ننجـ ى ا ُ ـ ؤمِن 
**(الانبیاء:٨٧-٨٨) واتە: یادی(ذوالنون)یش بکەرەوە، کاتێك بەتوڕەیی یەوە ڕۆیشت، گومانی کرد کەهـەرگیز دنیـای لـێ تـەنگ ناکەینـەوە جالەناو تاریکاییەکاندا هاوارو نزای لێ بـەرزبۆوەو ووتـی:پـەروەردگار هیچ خوایەك نیە جگە لەتۆ، پاکی وبێگەردی هەربۆ تۆیە بەڕاسـتی مـن لەستەمکاران بووم.ئێمەشی بەهانایەوە چووین و ڕزگارمان کرد لەوغەم**

**وپەژارەو تەنگانەیی کەتێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیماندااران ڕزگار دەکەین.**

١٤٢-دوعای ئەیوب(ع)چی بوو؟

**و/دوعای ئەیوب(ع)** ﴿وأيوب إذ نادى ربه أنى مسنى الضر وأنت أرحم الرحمين *فأستجبنا له فكشفنا ما به من ضر وءاتينه أهله ومثلهم معهم رحمة من عندنا وذكرى للعبدين﴾ **(الانبياء:٨٣-٨٤) واته: یادی ئەیوبیش بکە کاتێك هاواری بۆ پەروەدگار برد وتی:ئەی پەروەدگار بەڕاستی من ئازارو ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لەهەموو کەس میهرەبان تری.جائێمە نزامان گیراکردو بەهاواریەوە چووین وهەموو ناخۆشی ونەخۆشیەکمان لەکۆل کردەوە هەموو ماڵ و منداڵیمان پێبەخشیەوە و ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا، ئەو ڕەحمەتێکی تایبەتی بوو لەلایان ئێمەوە یادەوەریشە بۆ بەندە خواپەرستەکان.**

١٤٣- دوعای زەکەریا(ع)چیە؟

**و/دوعای زەکەریا** ﴿وزكريا إذنادى ربه ربّ لاتذرني فرداً وأنت خير الورثين *فأستجبنا له ووهبنا له يحيى وأصلحنا زوجه إنهم كانوا يسارعون في الخيرات ويدعوننا رغباً ورهباً وكانوا لنا خاشعين﴾ **(الانبیاء:٨٩-٩٠) واته: یادی زەکەریاش بکەرەوە کاتێك هانای بۆ پەروەردگار بردو وتی: ئەی پەروەردگار من بەتەنهایی مەهێڵەوە، تۆش چاکترین زاتێکی**

**لەپاش من و هەموو مردویەك دەمێنیتەوە.ئینجا ئێمە نزاكەیمان گیرا كردو(یەحیا)مان پێبەخشی، هاوسەرەكەشیمان بۆ چاككرد كەمنداڵی ببێ چونكە بەڕاستی ئەوانە چالاك وگورج و گۆڵ بوون لەئەنجامدانی هەموو خێرو چاكەیەكدا ونزای بەكوڵیان دەكرد و گەردن كەچ بوون بۆئێمە.**

١٤٤- چوار دوعای ئیبڕاهیم(ع)لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە دوعایەكان چین؟

**و/دوعایەكانی ئیبڕاهیم:.**

**١-** ﴿وإذْ قالَ إبراهيم ربِّ اْجعلْ هذا البلَد إمناً واجنبْ وبـ أن نعبـد الأصنام﴾ **(ابراهیم/٣٥) واتە: كاتێك ئیبڕاهیم نزای كردو ووتی:ئەی پەروەردگار بالی هێمنی و ئاسایش بكێشە بەسەر ئەم شارو ولاتەداو خۆم ونەوەكانیشم بپارێزە بتەكان بپەرستین.**

**٢-** ﴿ربنا إِنِّی أسكَنت مِن ذُرِّيـ بوادٍ غَير ذی زرعٍ عِند بيتك الُمحـرمِ ربنا ليقُيمواْ الصلَوةَ فَأجعلْ أفِئدةِ مِن الناسِ تهوی إِليهم واْرزقْهـم مِّـن الثمراتِ لَعلهم يشكُرونَ﴾ **(ابراهیم/٣٧) واتە: ئەی خودا بەراستی من هەندێ لەوەچەو خێزانم لەدۆڵێكی وشكی بێ كشتوكاڵدا جێنشینكردووە لەپاڵ ماڵە پیرۆزەكەتدا، ئەی خوایە بۆیە لێرە نیشتەجێم كردن تابەچاكی نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدەن جاداواكارم دڵی هەندێك لەو خەڵكە كەمەند كێش بكەیت، بۆلایان و لەرزق وڕۆزی**

**جۆراو جۆر بەهرەمەندیان بکەیت تا سوپاست بکەن.**

**٣-** ﴿ربِّ اْجعلْ  مقيم الصلوةِ ومِن ذُريـ ـ ربنـا وتقبـلْ دعـاءِ﴾ 
**(ابراهیم/٤٠) واتە: ئەی خودایە خۆم ونەوەکانم بگێڕە لـەو کەسـانەی کەئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی ئەی خودایە دوعاونزام گیرا بکە.**

**٤-** ﴿ربِّ هب ـ حكْماً وأَلْحِقْـ ـبالصاـ ـ *واجعل ـ لسانَ صِدقٍ ـ الأخِرين*واجعلـ ـمن ورثَةِ جنةِ النعيمِ*واغْفِر لأبِـى إنـه كـانَ مِـن الضال *ولا تخزِنى يوم يبعثُونَ * يوم لا ينفَع مالٌ ولابنونَ *إلا من أتى ا ـبقَلْبٍ سلِيمٍ﴾ **(الشعراء/٨٣-٨٩) واتە: ئەی خودایە زانیاری تەواوم پێببەخشەو پەیوەستم بکە بەچاکەکارانەوە و یادی خێرم با لەسـەر زاری نەوەکانی داهاتوم بمێنێت و بمگێڕە لەوکەسانەش کەبەهەشتی پڕ نـازو نیعمەت بەدەست دەهێنن و دەبنە خاوەنی.لەباوکیشم خۆشببەو بەڕاستی ئەو لەڕیزی گومڕاکاندا بوو، لـەڕۆژی زینـدو بونـەوەی ئـەو خەڵکـەدا شەرمەزارو خەجالـەتم مەکـە، ئـەو ڕۆژەی نـەماڵ سـوود دەبەخـشێت نەمنداڵ و نەوە مەگەر کەسێك بەدڵ و دەروونـی پـاك و بێگـەردو پـر لەئیمان بەخزمەت پەروەردگار گەیشتبێت.**

١٤٥- وعای سولەیمان (ع) چییە؟

**و/ دوعای سولەیمان ؟ ﴿قال رب اغفرلی وهب لـی ملكـا لاینبغـی لاحد من بعدی انك انت الوهاب﴾ (ص-٣٥) واتە: خوایـە مـوڵکێکی**

**وام پی ببەخشێ نەدرابێتە کەس و نەدرێتە کەسیش، تۆ بەخشندەی.**

١٤٦- دوعای نوح(ع)چیە؟

**و/دوعای سولەیمان (ع)** ﴿وقَالَ نوح ربِ لاتذَر علَى الأرضِ مِن الكفِرين دياراً * إنك إن تذَرهم يضِلواعِبادك ولا يلِدوا إلا فَاجِراً كفاراً * ربِّ أغْفِر لي ولولدى ولمن دخلَ بيتي مؤمِناً وللمؤمِنين والمؤمِنتِ ولاَ تزِدِ الظلمِين إلاتبارا﴾ **(نوح/٢٦-٢٨) واتە: ئینجا نوح وتی:ئەی خودایە هیچ کەسێك لەبێ بڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵەو تۆویان ببڕە، چونکە بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێبهێنیت، منداڵیان نابێت مەگەر تاوانبار نەبێت.ئەی خودایە لەخۆم ودایکم وباوکم و ئەوانە خۆش ببە کەدێنە ماڵم، لەئیمانداران ئافرەتیش خۆش ببە کەدێنە ماڵم بەئیمان وباوەڕەوە و لەئیمانداران پیاوو ئافرەتیش خۆش بە ستەمکارانیش بەشیان تیاچون بێت.**

١٤٧- دوعای موسا(ع)چیە؟

**و/دوعای موسا(ع)** ﴿وقَالَ موسى ربنا إنك ءَاتيت فِرعونَ وملأه زينةً وأمو الا في الحَيوةِ الدنيا ربنا لِيضِلواْ عن سبِيلك ربنا اْطْمِس علَى أموالِهم واْشدد علَى قُلُوبِهم فَلا يؤمِنوا حتى يرواْ العذَاب الأليم * قَالَ قَد أُجِيبت دعوتكُما فَاستقيما ولاتتبِعانِ سبيلَ الذين لايعْلَمونَ﴾ **(یونس/٨٨-٨٩)**

**واتە: موسا نزای کرد، وتی:ئەی خودایە بەراستی تۆ لەژیانی دونیادا نازونیعمەت وماڵ وحاڵ و جێگەی خۆشت بەفیرعەون بەخشیوە،**

**ئەوشتانە بوەتە هۆی ئەوەی خەڵكی وێل وگومڕا بكـەن، خودایـە مـاڵ وسامانیان تەفرو تونابكە، ئەمانە باوەڕ ناهێنن تاسـزاو ئـازار نـەبینن، خودا فەرمووی بێگومان دوعای هەردووكتان وەرگیرا، بەڵام ئێوە هـەر بەردەوام بن لەسەر ڕێبازی ڕاست ودروستی هیدایەت و شـوێن ڕێـازی ئەوانە مەكەون كەحەق نازانن و نافامن.**

١٤٨- دوعای پێغەمبەرمان موحەممەد(د.خ)چیە؟

**و/جبریل داوای لەپێغەمبەر(د.خ)كرد، لەخوای گەورە داوا بكا بۆشـتێ كەبیەوێ، كاتێ هەموو پێغەمبەرێك دوعایەكی هەیە، كـەخوای گـەورە قەبولی دەكا،پێغەمبەریش(د.خ)داوای كرد كەدوعایەكـەی خـۆی بـۆ ڕۆژی قیامەت ی هەڵگرێ بۆئەوەی بۆ ئۆمەتەكەی خۆی بپارێتەوە.**

١٤٩- ئەوپێغەمبـەرە كێیـە كـە خـوای گـەورە تێگەیـشتنی كتێبـی خـوای پێبەخـشی پـێش ئـەوەی ببێتـە پیـاوێكی گـەورە؟ ئـەو ئایەتەش بڵێ كەبەڵگەی ئەمەیە؟

**و/یـەحیا(ع)ی پێغەمبـەری خوایـە،كاتێ خـوای گـەورە دەفـەرموێ** ﴿یحیى خذِ الكِتب بِقُوةٍ وءَاتینه الحُكم صَبیاً﴾ **(مـریم١٢) واتـە: ئـەی یەحیا كتێبی تـەورات بەتونـدی بگـرەو پابەنـدی بـە هـەر لەتەمـەنی نەوجەوانیدا توانای جیاكردنەوەی ڕاست وناڕاستمان پێبەخشی.**

١٥٠- خوای گەورە بای خستە ژێر دەستی یـەكێك لەپێغەمبـەرەكان ئەو پێغەمبەرە كێیە؟

**و/ پێغه‌مبه‌ری خوا سوله‌یمانه(ع)خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ** ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ﴾ **(ص/٣٦) واته: بامان بۆڕام هێنا که‌به‌فه‌رمانی ئه‌و به‌نه‌رمی هاتوچۆ بکات بۆهه‌ر شوێنێك ویستی.**

**١٥١- یه‌کێك له‌پێغه‌مبه‌ره‌کان پاڕاوه‌و گوتی: میلله‌ته‌که‌م به‌سه‌ر منا زاڵ بوون ویاخی بوون و لایانداوه و هیچ توانایه‌کم نیه جاخۆت سه‌رم خه به‌سزایه‌ك له‌لایان خۆته‌وه،ئه‌و پێغه‌مبه‌ره کێیه؟**

**و/ئه‌و پێغه‌مبه‌ره نوح(ع)ه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ** ﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانْتَصِرْ﴾ **(القمر/١٠) واته: ئه‌ویش دوای٩٥٠ ساڵ هانا وهاواری بۆخوا بردو ووتی:خوایه به‌ڕاستی من شکستم خواردوه‌و سه‌رکه‌وتنم پێببه‌خشه.**

# پیشەسازی لە قورئاندا

١٥٢- خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئیشارەتی بۆ زۆر کارو پیشان کردووە کەخەڵکی لەزوووەوە ئەو کارانەیان زانیوە،یەکێك لەو کارانە رستنە،ئایەتێك بڵێ کەئیشارەتی بۆئەو پیشەیە کردبێ؟

و/**خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿ولا تكونوا كالتى نقضت غزلها من بعـد قوة أنكاثاً﴾ **(النحل٩٢) واتە: وەکو ئەو ئافرەتە مەبن کەریسەکەی دەکردەوە بەخوری، دوای رستنی هەڵی دەوەشاندەوە، ئێوەش بەلێن و پەیمانتان بکەنە هۆی فێڵ لەنێوانتاندا.**

١٥٤- پیشەی نانەوایی لەزوووەوە زانراوە،ئایەتێك بڵێ کەباسی ئەو پیشەیە بکات؟

و/**خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وقال الأخر إنى أرانى أحمل فوق رأسى خبزاً تأكل الطير منه﴾ **(یوسف٣٦) واتە: ئەوی تریشیان وتی:من خۆمم بینی لەخەونمدا، نانم بەسەر سەرمەوە هەڵدەگرت، باڵندە لێی دەخوارد.**

١٥٥- قورئانی پیرۆز ئیشارەتی بۆپیشەی دروستکردنی شوشە کردەوە،ئایەتێك بڵێ کەباسی ئەو پیشە هونەرییەی کردبێ؟

**و/خوای گەورە فەرمویەتی** ﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ﴾ **(النمــل/٤٤)** **واتە: ئەوسا پێی وترا بچۆرە کۆشـکەکەوە، جاکـە بـەلقیس بینــی وای زانی ئاوێکی زۆرەو قاچی خۆی هەڵکرد تاتەڕ نەبێت، سولەیمان گوتی ئەو پانتایە بەشوشە سەری گیراوە.**

١٥٦-قورئانی پـیرۆز ئیـشارەتی بۆپیـشەی قەسـابی کـردوە، ئایـەتێك بڵێ باسی ئەو پیشەیەی کردبێ؟

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قَالُوا الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ﴾ (البقـرة/ ٧١) **واتە: وتیان:ئائێستە هەواڵی ڕاستەقینەت پێداین سەریان بڕی، هەرچەندە خەریك بو ئەوکارەش نەکەن.**

١٥٧- قورئـانی پـیرۆز ئیـشارەتی بـۆ پیـشەی راوە ماسـی کـردووە، ئایەتێك بڵێ باسی ئەوکارە بکا؟

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ **(النحل/١٤) واتە: هەرئەو زاتەیە کەدەریای بـۆ بارهێنـاون، تـا گۆشتی نەرمو تازەی لێبخۆن.**

١٥٨- قورئانی پیرۆز ئیشارەی بۆپیشەی چوونە ناودەریـا کـردوە بـۆ دەرهێنانی گەوهەرو مرواری، بۆدروسـتکردنی خـشل،ئایەتێك بڵـێ باسی ئەو پیشەیە بکات؟

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وتستخرِ جواْ مِنـه حِليـةً تلْبـسونها﴾ **(النحل١٤) واته: تا لەناویدا جۆرەها گەوهەرو مرواری دەربهێنن و لەدەست وملی بکەن.**

١٥٩- قورئانی پیرۆز ئیشارەتی بۆ پیشەی نەحت کردوە،هەروەها پیشەی بەردهەڵکەندن،ئایەتێك بڵێ باسی ئەو پیشەیەی کردبێ؟

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وتنحِتونَ مِن ا ِلـبـال بیوتـاً فـارِه﴾ **(الشعراء/ ١٤٩) واته: هەروەها بۆتان دەلوێت مال وشوێنی خۆش لە چیاکان دا بتاشن و بەجوانی دروستی بکەن و بەخۆشی تیایدا کەشخەبن.**

١٦٠- قورئانی پیرۆز ئیشارەتی بۆ پیشەی بەرگدوورین و چنینی جل وبەرگ کردووە، ئایەتێك بڵێ کەباسی ئەوپیشەیەی کردبێ ؟

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿یبـ ءَادم قد اْنزلْنا علَیکُم لِباسـاً یـوری سوءَتِکُم وریشاً ولِباس التقْوی ذَلِك خ ذَلِك مِـن ءَایـتِ ا لَعلَّهُـم یـذکرونَ﴾ **(الاعراف/٢٦) ئەی نەوەی ئادەم ئێمە پۆشاکیمان بۆفەراهەم هێناون، عەورەت وئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دای ئەپۆشێت، هەروەها جل وبەرگی جوانیش کەخۆتانی پێ برازێننەوە بەڵام پۆشاکی تەقوا چاکترو خێردار ترە، بەڵکو یادەوەری وەربگرن.**

١٦١- قورئانی پیرۆز ئیشارەتی بۆ پیشەی دەریاوانی کردووە،

ئایەتێك بڵێ بەڵگەی ئەو پیشەیە بێ؟

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿أما السفينةُ فَكَانت ِلمساك   يعملُـونَ ـ الْبحرِ فأردت أنْ أعيبهاَ وكَانَ ورآءَهم مِلك يأخذُ كُل سفينةٍ غـضباً﴾ **(الكهف/٧٩) واتە: ئـەو كەشـتیەی عەیبـدارم كـرد، چـەند هـەژارێك خاوەنی بوون، لەدەریادا كاریان دەكرد، جـامنیش ویـستم عەیبـداری بكەم چونكە لەوناوە پادشایەك هەیە هەموو كەشتیەكی داگیر دەكرد.**

١٦٢-قورئـانی پـیرۆز ئیـشارەتی بۆپیـشەی بینـاكردن و پیـشەسازی بەردی تایبەت بەو پیشەیە،ئایەتێك بڵێ باسی ئەو پیشەیە بكات؟

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿فأوقِد ـ يهمن علَى الطِ   فأجعـل لّـى صرحاً لعلى أطِلع إ   إلِه موسى﴾ **(القـصص/٣٨) وتە:ئـەی هامـان تـۆ لەگەڵ خشتیكراوم بۆدروست بكەو قەڵایەكی بەرزو پتەوم بـۆ بینـا بكـە بەلكو پێیدا سەربكەوم تا خوای موسا ببینم.**

١٦٣- قورئـانی پـیرۆز ئامـاژەی بـۆ پیـشەی ئاسـنگەری و كلوپـەلی جەنگی كردووە، ئایەتێك بڵێ باسی ئەم پیشەیە یكات؟

و/ خـوای گـەورە دەفـەرمووێ ﴿ولَقَد آتينا داوود مِنا قَضلاً يا جِبالُ أوِبي معه والطير وألَنا لَـه الْحدِيـد (١٠) أن اعمـلْ سابِغاتٍ وقَدر فِي السردِ واعملُوا صالِحا إِني بِمـا تعملُـونَ بصِ ﴾ **(سبأ ١٠-١١) واتە:**

**١٦٤-قورئانی پیرۆز ئیشارەتی بۆ پیشەی دروست کردنی پرد کردوە ئایەتێکی قورئان بڵێ باسی ئەوپیشەیە بکات؟**

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قَالُواْ يذَا القَرنينِ إن يـأجوج ومـأجوج مفسِدونَ ـ الأرضِ فَهلْ نجعلُ لَك خرجاً علَى أن تجعلَ بيننا وبيـنهم سداً*قَالَ مامكنى فِيهِ ربى خير فأعِينو ـِقُوةٍ أجعـلْ بيـنكُم وبيـنهم ردماً*ءَاتو ـ زبر الْحديدِ حتى إذَساوى بين الصدفَينِ قَالَ انفُخَواْ حتى إذَا جعلَه ناراً قَالَ ءَاتو ـ أُفرِغْ علَيهِ قِطراً*فَما اسطَعواْ أن يظهروه وما استطعواْ لَه نقْباً﴾ **(الكهف/٩٤-٩٧) واتە:کاتێك دەسەڵاتی( ذوالقرنین) یان بینی وتیان: ئەی( ذوالقرنین) بەڕاستی یەئجوج مەئجوج تۆوی خراپەو تاوان دەچێنن لەزەویدا، ئایا پارەیەکت بۆ کۆبکەینەوە تابەربەستێك لەنێوان ئێمەو ئەواندا دروست بکەیت؟ (ذوالقرنین) ووتی:ئەو دەسەڵات و زانیاری و شتانەی پەروەدگارم پێبەخشیوم چاکترە بۆمن لەپارەو سامان، جائێوە بەهێزی بازو یارمەتیم بدەن تا بەربەستێکی بەهێز لەنێوان ئێوەو ئەواندا دروست بکەم، پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و کەلەکەی بکەن تا ئەم بەرو ئەو بەری کێوەکەی پڕکرد ئەوسا فەرمانیدا دابە موشەدەوە فوو بکەن لەو ئاگرەی کەلەژێردا کرابووەوە هەتا کاتێك هەمووی کرد بەئاگر ئینجا(ذوالقرنین) ووتی: ئادەی مسی تواوەم بۆبهێنن تا بیکەم بەسەریدا ئەوسا ئیتر یەئجوج و مەئجوج نەیان توانی**

**سەربکەون،نەیانتوانی کوناودەری بکەن.**

**١٦٥-قورئانی پیرۆز ئیشارەتی بۆ پیشەی دروست کردنی کەشتی کردوە،ئایەتێك بڵێ کەباسی ئەو پیشەیە بکا؟**

**و/خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿واصنع الفُلْك بأعيننا ووحينا ولا تخاطبني في الذين ظلموا إنهم مغرقون*ويصنع الفُلْك وكُلما مر عليه ملأٌ من قومه سخروا منه﴾ **(هود/٣٧-٣٨) واتە: کەشتیەکەش دروست بکە بەچاودێری ئێمە، تکامان لێ نەکەیت بۆئەوانەی لەسنوری ڕاستی دەرچوون، چونکە ئەوانە بڕیاری خنکاندنیان بۆدراوە، نوح یش کەشتیەکەی دروست کرد، هەر جارێك تاخمێك لەهۆزەکەی بەلایدا تێدەپەڕین گاڵتەیان پێ دەکرد.**

# پەند لەقورئاندا

١٦٦- زۆر لەپەنـــدی پێـــشينان وئەوانـــەی لەســـەر زاری خـــەڵك گوتراونەتەوە مانايەكی جێگيريـان لـەقورئانی پـيرۆزدا هەيـە، لـەو پەندانـەش: (چـاكترين كارئـەو كارەيـە كـەمام ناوەنـدی بـێ) ئايـا دەتـوانی مانـای ئـەو پەنـدە لەقورئانـدا بدۆزنەوە؟ئايـەتێك بڵـێ مانای ئەو پەندەی هەبێ؟

**و/بەڵێ ئەو ئايەتـەی مانـای ئـەو پەنـدە دەگەيـەنێ:خـوای گـەورە دەفەرموێ** ﴿ولا تجعلْ يدكَ مغلولَةً إ عنقِكَ ولا تبسطها كُلَّ الْبسطِ﴾ **(الاسراء/٢٩) واتە:نەكەيت ئەوەندە دەسـت نوقـاو بيـت، وەك ئـەوەی كەدەسـتی بـەكۆت و زنجـير بەگەردەنيـدا هەلواسـرابێت و هـەروەها ئەوەندەش دەست بڵاو مەبە هيچت بەدەستەوە نەمێنێت.**

١٦٧-ئايا لەقورئانی پيرۆزدا مانای:{ئـەوەی شـتێك نـەزانێ بـەدرۆی دادەنێ}هەيە؟

**و/بەڵێ،خوای گەورە دەفـەرموێ** ﴿بلْ كَذبواْ بِمالَم يحِيطواْ بِعِلمِـهِ﴾ **(يونس/٣٩) واتە: بەڵكو سەرەڕای ئەم هەموو بەڵگانە، ئەوانـە بڕوايـان بەقورئان نەهێنا كەهيچ شتێكيان دەربارەی نەزانيوە.**

**١٦٨- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای{ئاگات لـەزەبری ئـەو کەسـە بـێ چاکەت لەگەڵ کردوە}هەیە؟**

**و/بەلێ خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفـەرموێ** ﴿وما نقَموا إلا أنْ أغْناهم ا ُ ورسو له مِن فَضلِهِ﴾ **(التوبە/٧٤) واتە: هیچ شـتێك ئـەوانی تورەنەکردووە، تەنها ئەوە نەبێ خواو پێغەمبەرەکەی(د.خ)ئیماندارانیان دەوڵەمەند بەهرەمەند کرد.**

١٦٩- ئایـا لـەقورئانی پـیرۆزدا مانـای(مـرۆڤ لـە هـیچ کارێـك دڵنیـا نابێت تابەچاوی خۆی نەبینێ) هەیە؟

**و/بەڵێ خوای گەروە دەفەرموێ** ﴿قَالَ أَولَم تؤمِن قَـالَ بلـى ولكِـن لِيطْمئِن قَلـ ـ﴾ **(البقـرة٢٦٠﴾ واتـە: خـوا فـەرموی: ئایـا بـاوەڕت نەهێناوە؟ئیبراهیم ووتی:بەڵێ باوەڕم هەیە، بەڵام حەز دەکەم{بەچـاوی خۆم ببینم}تادڵم ئارام بگرێ.**

١٧٠- ئایـــا لـــەقورئانی پـــیرۆزدا مانـــای{حەرەکـــەت بەرەکـــەتی تیایە}هەیە؟

**و/بەڵێ، خوای گەورە دەفـەرموێ** ﴿ومن يهاجِر ـ سبيل اـ يجِـد ـ الأرضِ مراغَماً كثـ اً وسعةً﴾ **(النـساء /١٠٠) واتـە: ئـەوەی لـەپێناوی خودادا کۆچ بکات لەو زەویەی کۆچی بۆدەکات، سەربەرزیەك بۆ خۆی و ڕیسوایەك بۆ دوژمنانی دروست دەکات.**

**١٧١- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای{چۆن خەڵکی ئەزیەت دەی ئاوا ئەزیەت دەدرێی}هەیە؟**

**و/بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿مـن یعمـلْ سـوءاً یجزبـه﴾ **(النساء/١٢٣) واتە:ئەوەی خراپەو گوناهێك بكات ئەوا بەهۆیەوە سزا دەدرێت.**

**١٧٢-ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (ئەوەی بچێنێ دەی دورێتەوە) هەیە؟**

**و/بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿یوم تجِد كُل نفْسٍ ما عمِلَت مـن خـيرٍ محضراً﴾ **( ال عمران/٣٠) واتە: ڕۆژێك دێت هەموو كەس كاروكردەوەكانی خۆی دەبینێت ئامادە كراون.**

**١٧٣ ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (ئیماندار لەكۆنێكەوە، دووجار پێیەوە نادرێت) هاتووە؟**

**و/بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قالَ هلْ ءَامنكُم علَيه إلا كَما أَمنتكُم علَى أَخِيه مِن قَبلُ﴾ **(یوسف/٦٤) واتە:ئایاهەروا متمانەتان پێبكەم لەسەری مەگەر هەروەك پێشتر متمانەم پێكردن لەسەر یوسفی برای.**

**١٧٤- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(ئەوەی زاڵمێك سەربخا بەسەریدا زاڵ دەبێ)هەیە؟**

**و/بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿كُتِب علَيه أَنه من تولاه فَأَنه يـضِله

ويهديهِ إِلَى عذَاب السعـ ‌)﴾ **(الحــج/٤) واته:لەسەر شەیتان بڕیــار دراوە بێگومان ئەوەی شوێنی بکەوێت و بەگوێی بکــات گــومڕای دەکــات و ڕێگای دۆزەخی بۆ خۆش دەکات.**

١٧٥- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (ئاسن بە ئاسن چاك دەبێتــەوە) هەیە؟

**و/بەڵێ، خوای گەورە دەفــەرموێ** ﴿و جزؤا سـ ـيئَةٍ سـ ـيئَةٌ مِثْلُهـ ـا﴾ **(شوری/٤٠) واته: سزای خراپە خراپەیەکی وەکو خۆیەتی.**

١٧٦- ئایــا لــەقورئانی پــیرۆزدا مانــای{هەرشــتێ بەربێتــەوە، هــەڵ دەگیرێتەوە}هەیە؟

**و/بەڵێ خوای گەورە دەفــەرموێ** ﴿ ما يلفِظُ مِن قَولٍ إِلا لَديهِ رقيـ ـب عتيد﴾ **(ق/١٨) واته: هەرقسەیەکی لەدەم دەرچێ، خێرا چــاودێرێکی ئامادە تۆماری دەکات.**

١٧٧- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (دیوار بەگوێیە) هەیە؟

**و/بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وفيكُم سماعونَ لَهم﴾ **(التوبة/٤٧) واته:کەسانێك هەن لەنێو ئێوەدا گوێیان بۆدەگرن.**

١٧٨- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (ئەگەر بچێتە سەر زێی سـیروان وشکی دەکات) هەیە؟

**و/بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿أينما يوجِّهـ ـة لا يـ ـأتِ بِخـ ـ ٍ﴾

**(النحل) واتە: بۆهەرکوێ ڕەوانە بکرێ خێر ناداتەوە.**

١٧٩ ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(ئەوەی سەبر لەسەر دراوسێکەی بگرێ، خوای گەورە خانوی ئەوی پێدەبەخشێت) هەیە؟

**و/بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وأورثكم أرضهم وديارهم وأموالهم﴾ **(الاحزاب/٢٧) واتە: سەرئەنجام هەرچی زەوی وزارو ماڵ و خانوو سامانێکیان هەبووخوا بەئێوەی بەخشی.**

١٨٠- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (خوا ڕزقی کافریش دەدا) هەیە؟

**و/بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قُلْ من كانَ في الضلالةِ فليمدد له الرحمن مداً﴾ **(مریم/٧٥) واتە: ئەی موحەممەد(د.ح)بڵێ ئەوەی لەگومڕایی دایە باهەر خوای میهرەبان تەمەنی درێژو ماڵ و سامانی دنیایی پێببەخشێ.**

١٨١- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (چۆن بن ئاواتان بەسەر دێ)هەیە؟

**و/بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وكذَالك نولّي بعض الظالمين بعضا بما كانوا يكسِبونَ﴾ **(الانعام١٢٩) واتە: هەر بەو شێوەیەش ستەمکاران دەکەینە پشتیوان و خۆشەویستی یەکتر، بەهۆی ئەو کارانەی دەیانکرد.**

١٨٢- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای{هەموو قەدەغەکراوێك

ویستراوە}هەیە؟

**بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿ولا تقربا هذه الشجرة﴾ **(البقرة/ ٣٥)**

**واتە: بەڵام نزیکی ئەو درەختە مەکەون.**

١٨٣- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(ئەگەر مەلایکەتان هاتن شەیتان ڕا دەکات)هەیە؟

**بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿فلما ترآءت الفئتان نكص على عقبيه﴾ **(الانفال/٤٨) واتە: کاتێك ئەو دوو لەشکرە یەکتریان بینی دەست بەجێ شەیتان پاشەو پاش گەڕایەوە ووتی:من بەڕاستی بەریم لەئێوە.**

١٨٤- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(کلکی سەگ خوارە ئەگەر لەقالبیش بدرێ) هەیە؟

**بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه 

**(الانعام/٢٨) واتە: ئەگەر بگێڕدرێنەوە بۆ دونیا ئەوە هەر دەست دەکەنەوە بەو کارو کردەوانەی جاران دەیانکرد.**

١٨٥- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(هاوڕێکەت پێش ڕێگا) هەیە؟

**بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿إذ يقول لصحبه لا تحزن إن الله معنا 

**(التوبة/٤٠) واتە: پێغەمبەر(د.خ) بە ئەبوبەکری ووت:خەفەت مەخۆ،دڵنیا بە خوا لەگەڵمانە.**

١٨٦- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (سبەی بۆئەو کەسەی چاوەڕوانیەتی زوو دێت) هەیە؟

**بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿أليس الصبح بِقَريبٍ﴾ **(هود/٨١) واتە: ئایا بەرەبەیانی نزیك نیە؟!.**

١٨٧- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(بەدوای کلاوی بابردو مەکەوە) هەیە؟

**بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قُضى الأمر الذي فيه تـستفتيان﴾ **( یوسف/٤١) واتە: ئیتر ئەمەش وەڵامی لێکدانەوەی خەونەکانتانەو هەر ئەوەش بڕیاردراوە.**

١٨٨- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(ئەوەی چاڵ بۆبراکەی هەڵکەنێ خۆی تێدەکەوێ)هەیە؟

**و/ بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿ ولا يحيـق المكـر السـيء إلا بأهله﴾ **(فاطر٤٣) واتە: ئەوەی پیلانی شەڕوتاوانی کێشا پیلانەکە تەنها لەسەر خۆی دەشکێتەوە کەنەخشەی بۆ دەکێشێت.**

١٨٩- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای(ئەگەر شتێکی باش با فرێ نەدەدرا)هەیە؟

**بەلێ، خوای گەورە دەفەرموێت** ﴿ولو علم الله فيهم خيراً لأسمعهم﴾ **(الانفال٢٣) واتە: خۆ ئەگەر خوا خێری تیادا بەدی بکردنایە، ئەوەوای**

**لێدەکردن کەحەق وڕاستی ببیستن.**

١٩٠- ئایا لەقورئانی پیرۆزدا مانای (نسکۆی هەندێ کەس قازانجی هەندێکی ترە)هەیە؟

**بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿وإن تصبكم سيئة يفرحوا بها﴾ **(ال عمران/١٢٠) واتە: ئەگەر خراپەیەکتان بەسەر بێت ئەوان دڵیان پێخۆش دەبێت.**

## وتەی ناسکی قورئان

١٩١- ئیسلام ئاینی ئاسان کردن و فراوانییە و ئاینی ناخۆشی وتەنگانە نیە،ئایەتێك بڵێ ئەو مانایە بگەیەنێ؟

**و/ خوای گەورە دەفەرموێت** ﴿لا يكلف الله نفساً إلا وسعها﴾ **(البقرة/٢٨٦) واتە: هەرکەسێك بەگوێرەی توانای خۆی خوای گەورە داوای لێدەکات.هەروەها دەفەرموێت** ﴿يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر﴾ **(البقرة /١٨٥) واتە: خوا ئاسانکاری بۆئێوە دەوێت و نایەوێت پەرستن و فەرزەکانتان لەسەر گران بکات.**

١٩٢- خوای گەورە ئەمری بە بەندەکانی کردووە کەپارەی حەلال بخۆن و ئەوەش تەواوکردنی ئایینەو پێشی کاری چاکە(العمل

الصالح)ی خستوە،ئەو ئایەتە چیە، کەئەو مانایە دەگەیەنێ؟
و/ **خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿كُلُواْ مِن الطيبـتِ واعمَلُـواْ صـلِحاً﴾ **(المؤمنـون/ ٥) واتە: بخۆن لـەرزق ورۆزیـە چـاك و پاكـەكان، كـارو كردەوەی چاكیش ئەنجام بدەن.**

١٩٣- ئیمامی عەلی فەرمویەتی{لەقورئانـدا ئایـەتێك هەیـە هـەموو پزیشكی( الطّب)كۆكردۆتەوە،ئەو ئایەتە چیە؟
و/ **خـوای گـەورە دەفـەرموێ** ﴿وكُلُـوا واشـربواْ ولاتـسرفوا﴾ **(الاعراف/٣١) واتە: بخۆن وبخۆنەوە زیادەڕۆیی مەكەن.**

١٩٤- موسـڵمان لای خـوای گـەورە نـەبێ گلـەیی ناكـا، ئایـەتێك بڵـێ كەئەو مانایە بگەیەنێ؟
و/ **خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قَالَ إنما أَشكواْ بثّى وحزنى إلى اْ ِ وأَعلَم مِن ا ِ مالا تعلَمونَ﴾ **(یوسف/٨٦) واتە: وتـی: بەڕاسـتی مـن باسـی سكاڵاو غەم و پەژارەم هەر بـۆلای خـوا دەبـەم ئـەوەی مـن دەیـزانم لەلایان خواوە ئێوە نایزانن.**

١٩٥- ئەو ئایەتە كامەیە كەباسی ئـەوەی كـردوە كەپێغەمبەرایـەتی تەنیا بۆپیاوانەو بۆ ئافرەتان نیە؟
و/ **خوای گەورە دەفەرموی** ﴿وما أَرسلْنا قَبلَك إلا رِجالاً نوحى إِلَيهم﴾ **(الانبیـاء/٧) واتە: ئێمە پێش تۆ كەسانی ترمان ڕەوانە نەكردوە،جگـە**

**لەپیاوانێك كەوەحی و نیگامان بۆ ڕەوانە كردووە.**

١٩٦- كێ یەكەم كەس بوو داوای كرد حەج بۆماڵی خوا بكرێ ؟

**و/ باوكی پێغەمبەران، ئیبراهیم(ع)بوو.**

١٩٧- خــوای گــەورە لــەقورئانی پــیرۆزدا لەســورەتی ئەلــصافات لەئایــەتی یەكەمــدا دەفــەرموێ ﴿وٱلــصفات صَــفا﴾ مەبەســت لەوئایەتە كێیە؟

**و/ مەبەست لەوئایەتە مەلایكەتەكانن.**

١٩٨- دەگێڕنــەوە كــە هــاڕون ئەلرەشــید بەدەســتی خــۆی كفنــی بــۆ خۆی هەلبژاردوە بۆ كاتی مردنی،كاتێ سەیری كفنەكەی دەكرد دوو ئایەتی دەخوێندەوە،ئەو ئایەتانە چین؟

**و/ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿ما أغنى عنى ماليه*هلك عنى سـلطنيه﴾ **(الحاقة/ ٢٨-٢٩) واتە: ئەوەتە ئەو ماڵ وسامانەم فریام نەكەوت، ئــەو دەسەلاتەی هەمبوو نەماو لەدەستم چوو.**

١٩٩- ڕەحم لەقورئانی پیرۆزدا بەدوو مانا هاتووە یەكەمیان جێگای دروســت بــوونی كۆرپەلــەو دووەمیــشیان خزمایەتیــە، نمونــە بەهەردوو ماناكە بهێنەوە لەقورئاندا؟

**و/ ئەو ئایەتەی مانای دروست بوونی كۆرپەلە لەخۆی دەگــرێ، خــوای گەورە دەفــەرموێ** ﴿الله يعلم ما تحمل كل أنثى وما تغيض الأرحـام﴾

**(الرعد/٨٠) واتە: خوا چاك دەزانێت هەموو مێینەیەك چی لەسكیدا هەڵگرتووە، هەروەها بەوەش دەزانێت كەدەپوكێتەوەو لەبار دەچێت.**

**ئەو ئایەتەی مانای حزمایەتی دەگەیەنێ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿فَهلْ عسیتم أن تفسِدوا ـ الأرضِ وتقَطِعواْ أرحـامكُم﴾ **(محمد/٢٢)** **واتە: ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لەغەزا پشت هەلبكەن یاخود دەسەلاتتان كەوتە دەست تۆوی ئاژاوەو فەسادو تاوان لەزەویدا بچێنن وهەرچی پەیوەندی و خزمایەتی هەیە بیپچڕێنن.**

٢٠٠- یەكێك لەدوو ڕووەكان لەكاتی ئامادەبوون بۆ جەنگی تەبوك گووتی{لاتنفِرواْ ـ ا ـر} جاخوای گەورە لەقورئاندا وەلامی دایەوە ئەو وەلامە چی بوو؟

و/ **خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قُلْ نار جهنم أشد حـراً﴾ **(التوبە/٨١)**
**واتە: بلێ ئاگری دۆزەخ گەرمترە.**

٢٠١- خوای گەورە لەقورئاندا نمونەی بۆموسلمان وكارە چاكەكانی هێناوە هەروەها بۆ بێ باوەڕەكان وكردەوە خراپەكانیانی هێناوە ئەو ئایەتەی ئەو نمونانەی تیادایە كامەیە؟

و/ **خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿والبلَد الطیب یخرج نباته بإذن ربِه والذِی خبثَ لا یخرج إلا نكِداً كذِلك نصرف الأیـتِ لِقَـومٍ یـشكُرونَ﴾ 
**(الاعراف٥٨) واتە: ولاتی بەپیت وچاك وئاوەدان دارو درەخت و**

**ڕووەکی تێدا دەڕوێت بەفەرمانی پەروەردگاری، ئەوەی کەزۆنگ و پیس و بێ کەلك بێت هیچی لێ پەیدا نابێت، ئابەو شێوەیە بەلگـەی جـۆراو جۆر دەهێنینەوە، بۆ کەسانێك کەدلسۆزن و سوپاسی خوا دەکەن.**

٢٠٢- لـەقورئانی پـیرۆزدا ئایـەتێك ئیـشارەتی بـۆ پێـنج نوێژەکـە کردوە،ئەو ئایەتە کامەیە؟

و/ **خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿فَـسبحن ا ِ حـ ُتمـسونَ وحـ تصِبحونَ*ولَه ا َمد ِ السمواتِ والأرضِ وعشِياً وحـ تظْهـرونَ﴾  **(الـروم١٧-١٨) واتـە: واتـای(حـین تُمـسون) نوێـژی مـەغریب و عیـشایە،واتای(حـینُ تـصبحون)نوێـژی بەیانیـە،واتای(عـشیا)نوێـژی عەسرە،واتای(حین تَظهرون)نوێژی نیوەڕۆیە.**

٢٠٣- خوای گەورە پەیمانی داوە کە کتێبەکەی بپارێزێ لەدەسکاری کـردن و ون بـوون و کـەم کـردن و گـۆڕین.ئـەو ئایەتـەی ئـەو پەیمانەی تێدایە کامەیە؟

و/ **خوای گەورە دەفـەرموێ** ﴿إنا نحن نزلْنا الذِكْر وإنا لَه لَحافِظُونَ﴾  **(الحجر/٩) واتە: ئێمە قورئانمان دابەزاندوە و بێگومان هـەر ئێمـەش پارێزگاری دەکەین.**

٢٠٤- ئەوکەسەی گوێی لەئایـەتی ﴿فَبأي ءَالاءِ ربكُما تكـذِبانِ﴾ بێ لەسورەتی ئەلرەحمان چی دەڵێ؟

**دەلێ:خودایە ئێمە هیچ نازو نیعمەتێکی کەتۆ پێـت بەخـشیوین بـەدرۆ**

**ناخەینەوە.**

٢٠٥- خـوای گـەورە لەسـورەتی ئەلمجادەلـەدا دەفـەرموێ ﴿الــذین

یظهرونَ مِنكُم مِّن نسائِهم ماهن أُمهتهم إنْ أُمهتهم إلا الئی ولَـدنهم﴾
(المجادله/٢) مانای (الذین یظْهرونَ مِنكُم مِّن نسائِهم)چیە؟

**و/ مانای ئەو ئایەتە ئەوەیە یەکێك بەهاوسەرەکەی دەڵێت، تۆ لەجێگای دایکمدایت هاوسەرەکانیان بەو قسەیە نابنە دایکیان، چونکە دایکیـان ئەوانەن کەئەوانیان لێ بووە.**

**٢٠٦/ حوکمی (الطهار) چییە؟**

و/ نابێت لەهاوسەری نزیك بێتەوە، تاوەکو کەفارەتی سوێندەکەی نەدات

٢٠٧- کەفارەتی(الظّهار)چیە؟

**و/ ئەوەیە کەبەندەیەك رزگار بکا ئەگەر نەبوو، ئەوا دوومـانگ لـەدوو یەك بەرۆژوو بێ،ئەگەر نەشی توانی ئەوا دەبێ ٦٠هەژار نان بدات.**

٢٠٨- خوای گەورە لەسورەتی(الصف) ئایـەتی ٣دا دەفـەرموێ ﴿كبر مقْتاً عِندا ـ أن تقولواْ مالا تفْعلونَ﴾ مانای( المقت) چیە؟

**و/ (المقت)واتە تورەبونێکی زۆر.**

٢٠٩- سـورەتێك لـەقورئانی پـیرۆزدا هەیــە ژمـارەی ئایەتــەکانی ٣٠ئایەتە، لەرۆژی قیامەتدا دێتە هانـای خاوەنەکـەی ئـەو سـورەتە

**چیه؟**

**و/ سورەتی تەبارەکە( الملك ).**

**٢١٠- خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا﴾ **(الكهف/٦٥) واتە: لەوێ بەبەندەیەك لەبەندەکانی ئێمە ئاشنا بوو، کە لەرەحمەتی تایبەتی خۆمان بەهرەوەرمان کرد بوو، زانست و زانیاری تایبەتی خۆمانمان پێ بەخشیبوو، ئەو بەندە کێیە؟**

**و/ ئەو بەندە خدرە(ع).**

**٢١١- کورترین سورەتی قورئانی پیرۆز کامەیە؟**

**و/ سورەتی ئەلکەوثەر.**

**٢١٢- ژمارەی سوجدە بردن لەقورئانی پیرۆزدا چەندن؟**

**و/ پازدە سوجدە هەیە.**

**٢١٣- ژمارەی ئەو پێغەمبەرانەی خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ناوی هێناون چەندن؟**

**و/ ژمارەیان(٢٥)پێغەمبەرە.**

**٢١٤- ناوی ئەو چیایە چییە، کەکەشتی نوحی(ع) سەر کەوت؟**

**و/ ناوی: ئەلجودی یە.**

**٢١٥- سورەتێکی قورئان ئەو کەسەی هەموو ئێوارەیەك**

بیخوێنێتەوە لەئەشکەنجەی قەبر ڕزگار دەبێت و یەکێك لەناوەکانی(رزگار کەر)ە،ئەو سورەتە ناوی چیە؟

**و/ سورەتی ئەلمولك( تبارك)ە یە.**

٢١٦- ئەو تەیرەی قسەی کردوە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی چیە،ناوی ئەو پێغەمبەرەکێیە کەقسەی لەگەڵ کردوە؟

**و/ ناوی تەیرەکە پەپوسلێمانەیە.قسەی لەگەڵ سولەیمان(ع)کردووە.**

٢١٧- ئەو دارەی لەقورئانی پیرۆزدا لەعنەتی لێکراوە چ دارێکە؟

**و/ داری زەقومە کەخواردنی خەلکی دۆزەخە لەرۆژی دواییدا.**

٢١٨- بەبەنی ئیسرائیل گوتراوە ﴿وادخلوا الباب سجداً وقولوا حِطةٌ﴾ چیان کرد؟

**و/ لەسەر پاشەلیان چونە ژورێ و گوتیان (حبە فی شعیرە) واتە:دەنکۆلە جۆیەك.**

٢١٩- پایەدارترین سورەتی قورئانی پیرۆز کامەیە؟

**و/ سورەتی ئەلفاتیحەیە.**

٢٢٠- کامە لەدوو ئایەتە پێغەمبەر (د.خ) فەرموی((ئەگەر موسڵمان بیانخوێنێتەوە بەشیدەکات))؟

**و/ دوو ئایەتی کۆتایین لەسورەتی ئەلبەقەرە:** ﴿ءامن الرسولُ بما أُنزلَ إليهِ مِن ربهِ والمؤمنونَ كُلٌ ءامن بالله وملئكتهِ وكُتبِهِ ورسلِهِ لانفرق بين أحدٍ

ّمِن رسلِهِ وقَالواْ سمِعنا وأَطَعنا غُفرانك ربناء وإليك الْمص *لايكَلِف ا ُ
نفساً ِإلا وسعها لَها ما كَسب وعلَيها مااكْتسبت ربنا لا تؤاخِذنا ِإن نسِينا
أَو أَخطَانا ربنا ولا تحمِلْ علَينا ِإصراً كَما حملْته علَى الذِين مِن قَبلِنا ربنا
ولا تحمّلنا ما لا طَاقَةَ لَنا بِهِ واعف عنا واغْفِر لَنا وارحمنا أَنـت مولنـا
فانصرنا علَى القَومِ الْكفِرين﴾ **واته:پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە هەموویان باوەڕیان بەخواو فریشتەکان هەیەو پێغەمبەرەکانی دەڵێن هیچ جۆرە جیاوازیەك ناکەین لەنێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خوادا هەروەها ووتیان:ملکەچین ئەی خودا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرەنجام هەربۆلای تۆیە گەڕانەوە*خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەرهیچ کەسێك مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت هەر کارێکی چاك ئەنجام بدات، قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی، ئیمانداران دەڵێن ئەی خودایە لێمان مەگرە ئەگەر فەرا مۆشیمان بەسەردا هات یان گوناه وهەڵەیەکمان لەدەست قەوما ئەی خوایە ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا وەکە ئەوەی داوەتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمە گوناهمان بسرەوەو چاو پۆشی بکە لەهەڵەو تاوانەکانمان و داپۆشە، داواکارین سەرمان بخەیت بەسەر قەومی کافرو خوانەناساندا.**

٢٢١- پێغەمبەر(د.خ)ئەگەر نەخۆش کەوتبا هەندێ سورەتی دەخوێندەوەو لەناو لەپی فووی دەکرد، ئینجا بەلەشی دادەهێنا

ئەو سورەتانە چین؟

**و/ ﴿قُل هوا أحد......﴾ واتە:بڵێ:خوا تاك و تەنهایە........**

**﴿قُل أعوذُ برِبِ الفَلَق.....﴾ واتە:بڵێ:پەنا دەگرم بەو خوایەی کە بەرەبەیان پێش دێنێ....**

**﴿قُل أعوذُ برِبِ الناسِ....﴾ واتە:بڵێ:پەنا دەگرم بەپەروەردگاری خەڵکی.....**

٢٢٢- پێغەمبەر(د.خ)فەرمویەتی((حەسودی تەنیا بەدوو کەس نییە ))ئەوانە کێن؟

**و/ پیاوێك شەوان قورئانی دەخوێنێ و بۆی دانیشتوەو پیاوێکیش خوای گەورە پارەی داوەتێ بەشەوو بەڕۆژ خێری لێدەکا.**

٢٢٣- بەڵگە چیە ئەگەر مرۆڤ قورئانی لەبەر کرد لەبیری دەچێتەوە؟

**و/ پێغەمبەر(د.خ)دەفەرموێ{ بەردەوام قورئان بخوێننەوە بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، حوشتر چۆن خۆی رادەپریسنکێنی و لەدەست دەردەچێ، قورئانیش لەبیر دەچێتەوە.وەمانای((تعاهدوا )) واتە:هەموو کاتێك قورئان بخوێننەوە و بەبیرەخۆتانی بێننەوە تاوەکو ئەو قورئانەی لەبەرتان کردوە لەبیرتان نەچێ.وەمانای(أشدتقصیاً) واتە:زوو دەڕواو لەدەست دەردەچێ.**

٢٢٤- ئـەو یـاوەرە كێیـە كـە پێغەمبـەر(د.خ)حـەزی لێبـوو گـوێ لەقورئان خوێندنی ئەوبگرێ؟

**و/ یاوەری پایە بەرز( عەبوڵلای كوڕی مەسعود)**

٢٢٥- لـە موعجیزەكـانی عیـسا(ع)(الأكمـ ـ ـةِ)ی چـاك دەكـردەوە، (الأكمةِ) مانای چیە؟

**و/ (الأكمة) ئەو كەسەی بەكوێری لەدایك دەبێ.**

٢٢٦- پێغەمبەر(د.خ)دەفەرموێ ((پیـاوی تـەواو زۆرن، بـەڵام تـەنیا دوو ئافرەتی تەواو هەن)) ئەو دوو ئافرەتە كێن؟

**و/ مەریەمی كچی عیمران و ئاسیەی خێزانی فیر عەون.**

٢٢٧- كاتێ مەریەم عیسای كەوتە سكی كەس وكارەكەی پێیان گوت ﴿یمریم لَقَد جِئْتِ شیئاً فَریاً﴾ (مریم٢٧) واتە: ئەی مەریـەم كارێكی نالەبارو ئابرۆ بەرت ئەنجامداوە.مانای**(فَریاً)** چیە؟

و/ مانای (گەورە)یە.

٢٢٨- درێژترین ووشەی قورئان چیە؟

و/ **ووشەی** ﴿أنلْزِمكُموها﴾ یـە.

٢٢٩ —ووشەی دیاری (الهدیة)لـەقورئانی پـیرۆزدا بەواتایـەكی جیـا، لەمانای خۆی هاتووە،ئەو واتایە چیە؟

**و/ لەقورئاندا بەمانای بەرتیل (الرشوه) هاتووە لەچیرۆکی بەلقیس لەسورەتی(النحل) هاتووە** ﴿وإني مرسلةٌ إليهم بهدية فنا ظرةٌ بم يرجع المرسلونَ﴾ **(النحل/٣٥) واتە: من بریارمداوە کەدیاریەکیان بۆ بنێرم و/ جا چاوەڕێی ئەوەم بزانم نوێنەرەکان چ هەواڵێکم بۆ دەهێننەوە.**

٢٣٠- پایەی قورئان خوێن لەڕۆژی دواییدا چیە؟

**و/ پێغەمبەر(د.خ)دەفەرموێ: بە قورئان خوێن دەووترێت:بخوێنەوە وەکو چۆن لەدونیادا دەتخوێندەوە بۆ سەرەوە برۆ، پایەی تۆ لەلای دوا ئایەتە کەدە یخوێنیەوە.**

٢٣١- ئایا دەنگخۆشکردن لەقورئان خوێندنەوەدا پێویستو خوازراوە؟

**و/ بەڵێ، پێغەمبەر(د.خ)دەفەرموێ: قورئان بەدەنگی خۆتان برازێننەوە،دەنگی خۆش قورئان خۆشتر دەکات.**

٢٣٢- ئەو سورەتە چیە کە ئەگەر لەماڵێکدا خوێندراوە شەیتان لێی رادەکا؟

**و/ سورەتی ئەلبەقەرەیە، پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ (شەیتان لەو ماڵە نامێنێ کە سورەتی بەقەرەی تێدا دەخوێندرێتەوە)**

٢٣٣- ئەو سورەتە کامەیە کە ئەگەر حەوت ئایەتی یەکەمی لێ

**لەبەر بکەی، لەدەجالت دەپارێزێ؟**

**و/ سورەتی ئەلکەهفە.**

**٢٣٤- ئـــەو سورەتەچـــیە کەبۆپێغەمبـــەر(د.خ)دابـــەزی و زۆر لای خۆشەویستە؟**

**و/ سورەتی ئەلفەتحە** ﴿إنا فَتحنا لَك فَتحاً مبيناً*لِيغفِر لَك ا ُ ما تقَـدم مِن ذَنبِك وما تأَخر ويتِم نعمتَهُ علَيك ويهـدِيك صِـراطاً مـستقيماً﴾ 

**(الفــتح/١-٢) واتــە:ئــەی موحەممــەد(د.خ) ئێمــە ســەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت، تا خوا لەهەموو گوناهەکانی ڕابردوو ئایندەشت خۆش بێت وبەخشینەکانی لەسەرت تەواو بکات و بتخاتە ســەر ڕێگــای ڕاست و دروست.**

٢٣٥- ئەو سورەتەی وەکو چارەکێکی قورئان وایە،چ سورەتێکە؟

**و/ سورەتی ئەلکافیرونە** ﴿قُل يايها الْكَفِرونَ﴾ **واتە: بڵێ ئـەی کـافرو بێباوەڕەکان.**

٢٣٦- ئەو سورەتەی وەکو سێ یەکی قورئان وایە چ سورەتێکە؟

**و/ سورەتی ئەلئیخلاسە** ﴿قُل هو ا ُ أحد﴾ **واتە: بڵێ خوا کـە(الله)یـە یەکەو هیچ هاوتایەکی نیە.**

٢٣٧- ئـــەو ئایەتـــە کامەیـــە کـــەخودای گـــەورە ئـــەمری بەپێغەمبـــەر(د.خ)کـــرد کـــەڕووی لـــە نوێژکردنـــدا، لەبـــەیتی مەقدیسەوە بۆ کەعبە بگۆڕێ؟

**و/ خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿قَد نرى تقلب وجهك ـ السماءِ فَلَنـ و ـلينك ـِقبلَةً ترضها فَول وجهك شطْر الْمسجِدِ ا ـَـرام﴾ **(البقرة /١٤٤)**

**واتە:ئەی موحەممەد(د.خ)بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسورانی ڕوخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین، سوێند بەخوا ئێمەیش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕوو گەیەك پێی ڕازی و خۆشنوودبیت، ڕووت وەربچەرخێنە بۆ لای کەعبە.**

٢٣٨- خوای گەورە لەسورەتی(التكوير)ئایەتی(٢٣)دا دەفەرموێ ﴿ولَقَد رءَاه ـِبالْأُفُقِ ا ُبِـ ـ﴾ کێ کێی بینی؟

**و/ پێغەمبەر(د.خ)جبریلی(ع)بینی.**

٢٣٩- خوای گەورە لەسورەتی( ا طَفِفـ )ئایەتی(٧)دا دەفەرموێ ﴿كَلا ـإِن كِتب الْفُجارِ لَفى ـسِجينٍ﴾ مانای (سجين) چیە؟

**و/ مانای سجین:کتێبێکە کردەوە خراپەکانی بێ باوەڕوو دوو ڕووەکانی تێدا نوسراوەتەوە، سجین پێچەوانەی(علیین)ە کە کتێبی پیاوە چاکەکانەو لەهەمان سورەتیشدا هاتووە.**

٢٤٠- خوای گەورە لەسورەتی(الطارق)ئایەتی(١٢)دا دەفەرموێ ﴿والسماءِ ذَاتِ الرجعِ*والأرضِ ذاتِ الـ ـصدعِ﴾ ، **(الرَّجْع و الصَّدْع)**

**مانای چیە؟**

**و/ مانای** ﴿السماء ذات الرجع﴾ **واتە:هەموو ساڵێك ئاسمان باران دەبارێنێ و و** ﴿الأرض ذات الصدع﴾ **مانای ئەوەیە خاك درز دەبات‌و گیای لێ شین دەبێ، دوای ئەوەی بەباران ئاو دەدرێ و بەو جۆرەش خوای گەورە ڕسق و ڕۆزی مرۆڤ دەدات.**

**٢٤١- خوای گەورە دەفەرموێ** ﴿حفظوا على الصلوات والصلوة الوسطى وقوموا لله قانتين﴾ **واتە: ئاگاداری نوێژەكانتان بن و نوێژی ناوەڕاست،نوێژی ناوەڕاست مانای چیە؟**

**و/ نوێژی عەسر.**

**٢٤٢- دوای چ جەنگیك بوو خوای گەورە فەرموی** ﴿ليس لك من الأمر شىء أو يتوب عليهم أويعذبهم فإنهم ظلمون﴾ **(آل عمران١٢٨) واتە: بێگومان تۆ هیچ شتێكت لەكاروباری بەندەكان بەدەست نیە، بەڵكو هەموو شتێك بەدەست خوا خۆیەتی ئەگەر تەوبەو پەشیمانیان لێ وەربگرێت یان سزاو ئازاریان بدات چونكە ئەوان ستەمكارن؟**

**و/ ئەو ئایەتە دوای جەنگی ئوحود دابەزی، كاتێ پێغەمبەر(د.خ) ددانی موبارەكی شەهید كراو سەری شكێنرا، دەیفەرموو{چۆن میللەتێك سەر دەكەون روخساری پێغەمبەرەكەیان برینداركردو ددانیان شكاند}دوای ئەوەش خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاندوو**

**ئــــەوەی ڕۆن کـــردەوە کـــە کارەکـــە هـــەمووی بەدەســـت خـــوای گەورەیەوپێغەمبەریش(د.خ)هیچی لەدەست نایەت تەنها ئەوە نەبێت کـە دڵی بەتۆبەکردنەکەیان خۆشدەبێ و یا خـوای گـەورە سـزایان بـدا، جاخوای گەورە ئەمری بە پێغەمبەر(د.خ)کرد کەخەمیان بۆ نەخوا لەبەر ئەوەی ئەوانە ستەمکارن و خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردوە چونکە بێ باوەڕن.**

٢٤٣- لەسورەتی(الكهف)دا چوار چیرۆك هەن ئەو چیرۆكانە چین؟

**و/ ١ - چیرۆکی ئەصحابولکەهف**

**٢- چیرۆکی خاوەنی دوو باخچەکە.**

**٣- چیرۆکی موساوبەندە چاکەکەی(خدر)**

**٤- چیرۆکی ذی لقەرنەین.**

٢٤٤-ئـەو ئایەتـە چـیە کـەخوای گـەورە وەڵامـی ئـەبی جـەهلی داوەتەوە؟

**و/ خوای گەورە لەسورەتی( الأنفـال )ئایەتی(٣٣-٣٤)دا دەفـەرموێ:**

﴿وماكانَ اُ ليعذِّبهم وأنت فيهم وما كـانَ اُ معـذِّبهم وهـم يستغفِرونَ*ومالَهم ألايعذِبهم اُ وهم يصدونَ عنِ ا َسجِدِ ا َرامِ﴾ **واتە:**

**بێگومان خوای گەورە بەڵاو سزا دەر نیە لەکاتێکدا تۆ لـەناویان بیـت،**

**هەروەها خوا سزایان نـادات لەکاتێکـدا ئـەوان داوای لێخـۆش بـوون بکەن ئایا چی هەیە بۆ ئەوان کەخوا سزایان نەدات؟لەکاتێکـدا ئـەوان ناهێڵن خەڵك رووبکەنە کەعبە.**

٢٤٥- سورەتێکی قورئانی پیرۆز دە پیتی(و)ی تێدایەو لەسێ ئایـەت پێك دێت،چ سورەتێکە؟

**و/ سورەتی ئەلعەصر.**

٢٤٦- چ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز١٦ میمی تێدایە؟

**و/ خوای گەورە دەفـەرموێ ﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِّنَّا وَبَرَكَـاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّـا عَـذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (هود٤٨) واتە: ئەی نوح وەرە خـوارەوەو دابـەزە لەگەشـتیەکەو لەچـیای جـودی بـۆ دەشـتایی بـەبێوەیی و سـەلامەتی لـەلایان ئێمەوە،بەرەکەتی زۆریش لەسەر تۆو ئەو کۆمەڵ و خەڵکانەی لەگەڵ تـۆ دان،خەڵکانێکی تریش لەمەو دوا دێن لـەنازو نیعمـەت بـەهرەوەریان دەکەین پاشان سزای توندیان توش دێت.**

٢٤٧-ناوی سێ کتێبی تەفسیری قورئانی پیرۆز بڵێ؟

**و/ ١- تەفسیری ئیبن جەریری طەبری کەپێی دەگوترێ(جامع البیـان فی تفسیرالقران)**

**٢- تەفسیری (ئیبن کەثیر) کەئیبن کەثیری دیمەشقی دایناوە**

**٣- (الدُّرُّ المنثور فی التفسیر بالمائثور)ی سیوطی.**

٢٤٨-یەکەم کەس کەباسی ئیعجازی قورئانی پیرۆزی کردوە کێیە؟

**یەکەم کەس کەباسی ئیعجازی قورئانی پیرۆزی کردوە جاحظە لەساڵی ٢٥٥ی کۆچی.**

٢٤٩- باسی سێ جۆر لەجۆرەکانی ئیعجازی قورئانی پیرۆز بکە؟

**و/ ١- ئیعجازی زانستی(عیلمی)**

**٢- ئیعجازی ژمارەیی (عددی)**

**٣- ئیعجازی ئەدەبی( أدبی)**

٢٥٠- حەوت یاوەر ناوبانگیان بەخوێندنەوەو فێرکردنی قورئان دەرکردوە ئەو حەوت یاوەرە کێن؟

**و/ (عوسمانی کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ئوبەی کوڕی کەعب، زەیدی کوڕی ثابت، عەبدوللای کوڕی مەسعود، ئەبولدەرداء، ئەبوموسای ئەشعەری)**

٢٥١- لەچ ساڵێکدا خالیان بۆ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دانـاو کێ سەرەتا بەم کارە هەڵسا؟

**و/ لەساڵی ٦٧ی کۆچی دەست کرابەخاڵدانان بۆ قورئانی پیرۆز،**

**خەڵکی لەتێکچوون و شێوانی ووشەکانی قورئــان دەترســان، چــونکە خاڵی بۆ دانەنرابوو بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕی و ئەبوئەسوەد ئەلدەئولی یەکەم کەس بوو، کەخاڵی بۆ قورئان دانا.**

٢٥٢- مانــای حــەوت خوێندنــەوە بەناوبانگەکــەی قورئــانی پــیرۆز چیە، و ناوی خاوەنی ئەو خوێندنەوانە چیە؟

**و/ ئەو حەوت خوێندنەوە لە شێوەزاری عەرەبی وەرگیراوە وەکو زمانی قورەیش و زمانی هەرزێل و زمانی یەمەن و زمانەکانی عەرەبان وەکــو زارە جیایەکانی یەك زمانە ئەو خوێندنەوانەی لەبەر دەســتەکانداندان لــە حــەوت پیتــەکانی( الاحــرف الــسبعە)و بۆتــە حــەوت خوێندنــەوەی بەناوبانگ و حەوت خوێنەرن ئەوانیش**

**١- عەبدوڵلای کوڕی کەثیر ئەلداری**

**٢- عەبدوڵلای کوڕی عامر ئەلیەحصبی**

**٣- عاصمی کوڕی ئەبی ئەلنجود**

**٤- ئەبوعەمری کوڕی ئەلعەلاء**

**٥- حەمزەی کوڕی حەبیب ئەلزەیات**

**٦- نافیعی کوڕی عەبدولرەحمان**

**٧- عەلی کوڕی حەمزەی کەسائی**

**لەفەرمودەیـــەکی صـــەحیحدا کـــە ئیمـــامی بوخـــاری دەگێڕێتـــەوە پێغەمبەر(د.خ)دەفەرموێ (أقرأني جبريلُ على حرف،فراجعتهُ فلم أزل أستعيده حتى انتهى إلى سبعةِ أحرف) واته: جبريل قورئـانی بەیـەك پیت پیێ خوێندمەوە،دوایی دوبارەم کـردەوە ئێـستاش هـەر دوبـارەی دەکەمەوە تا گەیشتە حەوت پیت.**

٢٥٣- ئایـا دەبـێ قورئـان جگـە لـەزمانی عـەرەبی بـە زمـانێکی تـر بخوێندرێتەوە؟

**و/ نـــەخێر نـــابێ قورئـــان بـــەزمانێکی جیـــا لـــەزمانی عـــەرەبی بخوێندرێتەوە،ئەوەش نەوەك توشـی هەڵـە بێـت لـەکاتی نوسـینەوەی قورئان بەزمانێکی جیا لەزمانی عەرەبی، هەرچی وەرگێڕانی واتاکانی قورئان بۆ زمانەکانی دی ڕێپێدراوە، ئەوەش بۆئاسانکردنی تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز.**

٢٥٤-کامـــەیان چـــاکترە لـــەقورئان خوێندنـــدا لەســـەر کتێـــب بخوێندرێتەوە یا لەئەز بەر بخوێندرێتەوە؟

**و/ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لەسـەر کتێـب بـێ چـاکترە، چـونکە خوێندنەوە لەسەر قورئان عیبادەتێکی داواکراوەو ئەو کاتە خوێندنـەوەو سەیر کردن بۆ نوێژکەر کۆدەبێتەوە.**

٢٥٥- ئەو نوێژانە کامانەن کەوا چاکە نوێژکەر بەدەنگێکی بەرز قورئان بخوێنێتەوە تیایدا؟

**و/ لەنوێژی بەیانیان و نوێژی هەینی و هەردوو جەژنەکان ودوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی مەغریب و عیشاو لەنوێژی تەراویح و وەترو نوێژی خۆرگیران و نوێژی باران و خوێندنەوەی بەدەنگی بەرز لەو نوێژانە موستەحەبە بۆ ئیمام و ئەو کەسەی کەبەتەنیاش نوێژ دەکات، هەرچی ئەوەی لەپشت ئیمامە ئەوا خوێندنەوەی ئیمامەکە بۆ ئەویشە، دەبێ گوێ لەئیمامەکەی بگرێ.**

٢٥٦-حوکمی سوجدەی تیلاوە چیە؟

**و/ سوجودەی تیلاوە لەلایان کۆمەڵی زانایان بەکارێکی چاك دانراوە، لەعومەری کوڕی خەتاب دەگێڕنەوە،کەڕۆژی جومعە بوو لەسەر مینبەر سوڕەتی ئەلنەحلی خوێندەوە تا کاتی سوجدە بردن هات، سوجدەی بردو خەڵکەکەش سوجدەیان برد تا جومعەیەکی تر داهات خوێندیەوە تاگەیشتە سوجدە فەرموی: خەڵکینە بەسوجدەدا تێدەپەڕین جا ئەوەی سوجدە باچاکە و ئەوەی سوجدەش نەباقەیناکە و ئەمجارە عومەر سوجدەی نەبرد. (بوخاری گێڕایتیەوە)**

١- ناوی دایك وباوكی سەروەرمان محمد(د.خ)چی یە؟

**و/ ناوی باوكی: عەبدوڵلای كوڕی عەبدولموتەلیبە و ناوی دایكی: ئامینەی كچی وەهەبە.**

٢- تەمەنی پێغەمبەر(د.خ)چەند بوو، كاتێك باوكی كۆچی دوایی كردولەكوێ كۆچی دوایی كرد؟

**و/ پێغەمبەر(د.خ)كۆرپەیەكی دوومانگی بوولەسكی دایكی كاتێك باوكی لەمەدینەی مونەوەرە كۆچی دوایی كرد**

٣- لەچ ساڵێكی زایینی پێغەمبەر(د.خ)لەدایك بووە؟

**و/لەساڵی پێنج سەدوحەفتای زایینی(٥٧٠ ز).**

٤- ئەوساڵەی پێغەمبەر(د.خ)تیایدالەدایك بوو بەچ ساڵێك ناونرا؟

**بەساڵی فیل ناونرا.**

٥- ئەو شتە ناوازەیەچی بوو، كەئامینەبینی لەكاتی لەدایك بوونی پێغەمبەر(د.خ)؟

**و/بینی ڕوناكیەك لەلاشەی دەردەچێت كۆشك وتەلارەكانی شامی ڕوناك دەكردەوە.**

٦- ناوی ئەو مامانەچی بوو، كەسەرپەرشتی لەدایك بوونی پێغەمبەر(د.خ)ی دەكرد؟

**و/شیفای دایكی عەبدولرەحمانی كوڕی عەوف، سەرپەرشتی لەدایك**

**بوونی پێغەمبەر(د.خ)ی کرد.**

٧- کێ یەکەم کەس بووشیربداتە پێغەمبەر(د.خ)دوای دایکی؟

**و/ثـوەیـەی جاریـەی ئەبولەهـەب یەکـەم کـەس بـوو، شـیری دا پێغەمبەر(د.خ).**

٨- کێ ناوی محمدی لە پێغەمبەر(د.خ) نا؟

**و/عەبدولموتەلیبی باپیری .**

٩- کێ دایەنی پێغەمبەر(د.خ)بوو؟

**و/حەلیمەی سەعدیە.**

١٠- چەندساڵ پێغەمبەر(د.خ)لەلای حەلیمەی سەعدیەمایەوە؟

**و/ پێنج ساڵ لەلای حەلیمەی سەعدیەمایەوە.**

١١- ئەو ڕوداوەناوازەیەچی بوو کە پێغەمبەر(د.خ)توشی بووکاتێك لەناوخێلی بەنی سەعدبوو؟

**و/ڕووداوی سینگ لەت کردن ودەرهێنانی بەشـی شـەیتان بوولـەدڵی پێغەمبەر(د.خ).**

١٢- تەمـەنی پێغەمبـەر(د.خ)چـەند بووکـاتێ دایکـی کۆچـی دوایـی کرد؟ولەکوێ کۆچی دوایی کرد؟

**و/تەمـــەنی پێغەمبـــەر(د.خ)شـــەش ســـاڵ بـــوو، دایکیـــشی لـــە (الأبواء)کەدەکەوێتە نێوان مەککەو مەدینە کۆچی دوایی کرد.**

١٣- دوای کۆچی دوایی دایکی کێ پێغەمبەر(د.خ)ی بەخێو کرد؟

**و/عەبدولموتەلیبی باپیری بەخێوی کرد.**

**١٤- پێغەمبەر(د.خ)تەمەنی چەند بوو، کاتێك باپیری کۆچی دوایی کرد؟**

**تەمەنی هەشت ساڵ بوو.**

**و/١٥- سەرپەرشتی کردنی پێغەمبەر(د.خ)کەوتە ئەستۆی کێ دوای کۆچی دوایی باپیری؟**

**و/ئەبوتالیبی مامی.**

**١٦- ئەوپیشەیەچی بوو کە پێغەمبەر(د.خ)لەمنداڵی وەکو پێغەمبەرەکانی ترئەنجامی دەدا؟**

**و/پیشەی شوانەتی بوو.**

**١٧- تەمەنی پێغەمبەر(د.خ)چەندبووکاتێك یەکەم گەشتی بازرگانی کردوگەشتەکەی بۆکوێ بوو؟**

**و/تەمەنی دوازدەساڵ بوو،گەشتەکەی بۆشام بوو.**

**١٨- ئەوقەشەیەکێ بوو کە پێغەمبەر(د.خ) لەگەشتەکەیداچاوی پێکەوت هەواڵی پێغەمبەرایەتی ڕاگەیاند؟**

**و/بەحیرای راهیب بوو.**

**١٩- چۆن بەحیرای قەشە دڵنیابوو لەوەی موحەممەد ئەوپێغەمبەرە چاوەڕوانکراوەیە؟**

**و/بەهۆی بونی مۆری پێغەمبەرایەتی لەپشتی پێغەمبەر(د.خ).**

٢٠- یەکەم شەڕکامەبوو کە پێغەمبەر(د.خ)بەشداری تیاکرد؟

**و/یەکەم شەڕکە پێغەمبەر(د.خ)بەشداری تیا کرد، شەری فیجار بوو لەنێوان قورەیش وبەنی قەیس.**

٢١- یەکەم پەیمان بەستن کە پێغەمبەر(د.خ)بەشداری تیاکرد کامەبوو؟ئامانج لەم پەیمان بەستنە چی بوو؟

**و/یەکەم پەیمان بەستن کە پێغەمبەر(د.خ)بەشدری تێدا کردپەیمانی(فضول) بوو بۆسەرخستنی زوڵم لێکراوەکانی مەککە.**

٢٢- پێغەمبەر(د.خ)بەچ نازناوێك ناوبانگی دەرکردبوو لەمەککە؟

**و/نازناوی ڕاستگۆی دەستپاك.**

٢٣- بۆچی خەدیجەی دایکی موسڵمانان پێغەمبەر(د.خ)ی هەڵبژارد بۆئەوەی بازرگانیەکەی بباتە شام؟

**و/لەبەرئەوەی ناوبانگی ڕاستگۆیی و دەستپاکی و ڕەوشت بەرزی پێغەمبەر(د.خ)پێگەیشتبوو.**

٢٤- ئەوغولامەی خەدیجە ناوی چی بووکەبوو بەهاوەڵی پێغەمبەر(د.خ)لەگەشتەکەیدا؟

**و/ناوی مەیسەرە بوو.**

٢٥- ئەودەستە خوشکەی خەدیجە ناوی چی بوو کەبە پێغەمبەر(د.خ)ی گوت خەدیجە بخوازێ؟

**و/نەفیسەی کچی مەنییەی دەستە خوشکی بوو.**

٢٦- مارەیی خەدیجەی دایکی موسڵمانان چەندبوو؟

**و/مارەیی یەکەی بیست حوشتری جاحێل بوو.**

٢٧- تەمەنی پێغەمبەر(د.خ)چەند بوو کەخەدیجەی هێنا تەمەنی خەدیجە چەندبوو؟

**و/تەمەنی پێغەمبەر(د.خ)بیست وپێنج ساڵ بوو ،تەمەنی خەدیجەش چل ساڵ بوو**

٢٨- پێغەمبەر(د.خ)چەند منداڵی لەخەدیجەهەبوو ناوەکانیان چی بوو؟

**و/منداڵەکانی پێغەمبەر(د.خ)لەخەدیجە شەش بوون، ناوەکانیان(عەبدوللا،ئەلقاسم،زەینەب،روقیە، ئوم کولثوم،فاتیمە)**

٢٩- باسی هەندێ لەوکەرامەتانە بکە کەخوای گەورە بەپێغەمبەری بەخشیوە بەرلەوەی ببێ بە پێغەمبەر؟

**و/ ئەگەر ڕۆژگەرم با، هەور سێبەریان لێ دەکرداورەدەخت وبەرد سڵاویان لێدەکردکاتێك بەلایاندا تێپەڕ با.**

٣٠- یەکەم نیشانەی پێغەمبەرایەتی چی بووکە لە پێغەمبەر(د.خ)دەرکەوت؟

**و/یەکەم نیشانەی پێغەمبەرایەتی خەونی ڕاست بوو.**

٣١- ئەوئەشــکەوتە نــاوی چــی بــوو کــە پێغەمبــەر(د.خ)پــێش پێغەمبەرایەتی خواپەرستی تیا دەکردو لەکوێ بوو؟

**و/ناوی ئەشکەوتی حەررایە لەچیای نور دەکەوێتە کێوی نور.**

٣٢- پێغەمبــــەر(د.خ)لـــەکوێ بـــوو کەیەکـــەم جـــار وەحـــی بۆهاتەخوارەوە؟

**و/لەئەشکەوتی حەررابوو خواپەرستی دەکرد.**

٣٣- پێغەمبــەر(د.خ)تەمــەنی چــەندبوو کــاتێ یەکــەم جــار وەحــی بۆهاتەخوارەوە؟

**و/تەمەنی چل ساڵ بوو**

٣٤- یەکەم ئایەت بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاتەخوارەوە چی بوو؟

**و/یەکەم ئایەت کەبۆ پێغەمبەر(د.خ)هاتــەخوارەوە ﴿اقرأ بأسم ربـــك الذي خلق*خلق الإنسانَ مِن علق*اقرأوربك الاكــرم*الــذي علــم بالقلم*علم الإنسان ما يعلم﴾ العلق/١-٢.**

٣٥- کێ یەکەم کەس بوو کەبڕوای بە پێغەمبەر(د.خ)هێنا؟

**و/یەکەم کەس خەدیجەی خێزانی بــڕوای پێهێنــا، دوای ئــەو زەیــدی کـــوری حـــاریثـــە و ئینجـــا عـــەلی کـــوری ئـــەبوتالیب وهـــاوڕێی پێغەمبەر(د.خ)ئەبوبەکری سدیق.ڕەزای خوایان لێبێ.**

٣٦- بانگەوازبۆ ئیسلام چەند ساڵ بەنهێنی مایەوە؟

**و/بانگەواز بۆئیسلام سێ ساڵ بەنهێنی مایەوە.**

٣٧- یەکــەم فــەرمانی خــودا کامەیــە، کــەبڕیاری ئاشــکراکردنی بانگەوازی داوە؟

**و/فــەرمودەی خــوای گــەورە: ﴿ وأنــذِر عــشِ نك الأقــرب ﴾** الشعراء/٢١٤

٣٨- پێغەمبــــەر(د.خ)چــۆن فــــەرمانی خــــوای بەجێگەیانــــد بۆئاشکراکردنی بانگەواز؟

**و/چوە سەرچیای سەفاو قورەیشیەکانی کۆکردەوەوبانگی کردن بۆئــەوەی بــاوەڕ بــەخوای گــەورە بێــنن وخوایپەرســتن وخۆیــان لەئاگردووربکەنەوە.**

٣٩- قورەیــشیەکان چــۆن ڕووبــەڕووی بانگەوازبوونــەوە هەنــدێ لەڕەفتارەکانیان باس بکە؟

**و/قورەیشیەکان بەچەندرەفتارێك ڕووبەڕووی بانگەواز بونەوە، ئەوانیش گاڵتــەکردن بــە پێغەمبــەر(د.خ)و بەموســڵمانان و شــێواندنی ئیــسلام وگومان بۆدروست کردن وبەرەنگاربونەوەی قوڕئــان ووەســف کردنــی بەئەفسانەو حەکایەتی پێشینان.**

٤٠- ئــــەوڕەفتارەی قوڕەیــــشیەکان گرتیانەبــــەر چــــی بــــوو بۆبەرەنگاربونــەوەی بانگــەواز، دوای پوچــەڵبوونەوەی ڕفتارەکــانی پێشوویان؟

**و/قورەیشیەکان لێژنەیەکیان پێك هێنا کەلەبیست وپێنج کەس لەسەرکردەکانیان بەسەرۆکایەتی ئەبولەهەب،بڕیاریانداکەئازارو ئەشکەنجەی موسڵمانان بدەن.**

٤١- کێ یەکەم کەس بووکەئازاری پێغەمبەر(د.خ)ی دا؟

**و/یەکەم کەس ئەبولەهەبی مامی پێغەمبەر(د.خ)لەگەڵ خێزانەکەی ئوم جەمیل ﴿ الله ا طب﴾ .**

٤٢- لەسەرەتای بانگەواز،کێ بوون ئەوانەی زۆرئازاری پێغەمبەر(د.خ)یان دا؟

**و/ (ئەبوجەهل،عوتبەی کوری رەبیعە،شیبەی کوری رەبیعە،ئومەیەی کوری خەلەف،عوقبەی کوری ئەبی موعیت).**

٤٣- کێ یەکەم ئافرەتی شەهیدە لەئیسلام؟

**و/سومەیەی کچی خەیات، (دایکی عەمماری کوری یاسر).**

٤٤- پێغەمبەر(د.خ) لەکوێ بەنهێنی، لەگەڵ موسڵمانان کۆدەبوەوە؟

**و/لەماڵی ئەلئەرقەم کوری ئەلئەرقەمی مەخزومی کۆدەبونەوە.**

٤٥- یەکەم کۆچ کردن بۆحەبەشە کەی بوو؟ژمارەی کۆچکردوەکان چەندبوو؟

**و/یەکەم کۆچ لەساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتی بوو ژمارەشیان دوازدە پیاوو چوار ژن بوون.**

٤٦- سەعدی کوری ئەبی وەقاس توشی چ نەهامەتیەك، هات کاتێ

بوە موسڵمان؟

**و/دایکی موشریك بوو، مانی گرت وتی یائەودینە بەجێدێڵی یاهیچ ناخۆم وناخۆمەوە تادەمرم.**

٤٧- ئایاسەعدی کوری ئەبی وەقاس بەگوێی دایکی کرد؟

**و/نەخێر...بەگوێی دایکی نەکرد،خوای گەورەفەرموی ﴿وإن جهداك على تشرك ـ ماليس لك به عِلم فلاتطِعهما﴾ لقمان/١٥، واتا ئەگەر داوایان لێ کردی شەریك بۆخوای گەورەپەیدابکەی فەرمانیان بەجێ مەهێنە.**

سەعد بەدایکی وت: بەوخوایەئەگەرسەد گیانت هەبێ ویەك یەك دەرچن ئەو ئایینە جێناهێڵم،جاحەزدەکەی نان بخۆ حەزیش ناکەی مەیخۆ دایکیشی دوای ئەوەی لەخۆی بێزار بوو، ئینجا دەستی بەخواردن کردەوە.

٤٨- ژمارەی ئەوکەسانەی جاری دووەم کۆچیان کرد بۆ حەبەشە چەندبوون؟

**و/پیاوەکان:هەشتاوسێ کەس وئافرەتەکانیش هەژدەئافرەت یان نۆزدە ئافرەت بوون.**

٤٩- ناوی پاشای حەبەشە کەپێشوازی لێکردن چی بوو؟

**و/ناوی نەجاشی بوو.**

٥٠- قورەیـــشیەکان پـــەنایان بـــۆچ ڕێگایـــەك بردبۆنەهێـــشتنی پێغەمبەر(د.خ)و بانگەوازەکەی؟

**و/قورەیشیەکان نێوانیان لەگەڵ بەنی هاشم وبەنی موتەلیب تێکــچوو و گەمارۆیان دان لەدۆلی ئەبوتالیب تاکو پێغەمبەر(د.خ)یان تەسلیم بکەن بۆئەوەی بیکوژن.**

٥١- ئابلۆقەی موسلمانان چەند ساڵی خایاند؟

**و/سێ ساڵی خایاند.**

٥٢-لە چ ساڵێك ئابلۆقەیان لەسەر لابراو کێ بەم کارەهەڵسا؟

**و/لەساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی ئابلۆقەیان لەسەرلابراو ئەوانەی پــێ هەڵــسان: (هیــشامی کــوری عــەمر،زوهێر کوری ئومەیە،ئەبولبەختــەری کوری هیشام ،موتعیمی کوری عەدی،زەمعەی کوری ئەسوەد)**

٥٣- ئەوپەڕاوەی بڕیاری لێکدابرانەکەی تێدانوسرابوو چی لێهات؟

**و/خوای گەورە مۆرانەی نارد پەڕاوەکەی خــوارد تــەنیاواژەی (بــسمك اللهم)نەبێ.**

٥٤- بۆچی ساڵی خەم{عام الحزن}ئەوناوەی لێنرا؟

**و/بــەهۆی کۆچــی دوایــی کردنــی خەدیجــەو ئــەبو تــالیبی مــامی پێغەمبەر(د.خ) لەو ساڵەدا.**

٥٥- خەدیجەتەمەنی چـەندبوو کەکۆچـی دوایـی کردولـە چ سـاڵێك ئەوەڕویدا؟

**و/تەمەنی شەست وپێنج ساڵ بوو،لەساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی بوو.**

٥٦- یەکـەم خێزانـی پێغەمبـەر(د.خ)هێنـای دوای کۆچـی دوایـی کردنی خەدیجە کێ بوو ؟ و کەی بوو؟

**و/یەکەم خێزانی پێغەمبەر(د.خ) دوای کۆچی دوایی کردنی خەدیجە، هێنانی دایکی موسڵمانان سۆدەی کچی زەمعە بوو لەساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی .**

٥٧- پێغەمبەر(د.خ)لەگەل کێ دەرچوو بۆبانگەوازکردنی خەڵکی تایف؟و چەندڕۆژ لەوێ مایەوە؟

**و/لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسە دەرچوو،دەڕۆژ لـەناو خـەڵکی تـایف مایەوە.**

٥٨- خـەڵکی تـایف چـۆن وەڵامـی پێغەمبـەر(د.خ)یـان دایـەوە؟ پێغەمبەر(د.خ) چ دوعایەکی کرد لەبەر ئەوکارەیان؟

**و/هەموویان کۆبونەوەو دەستیان بەبەردهاوێشتن وقسەی ناشیرین کرد بـۆ پێغەمبـەر(د.خ)تاپێڵاوەکـانی لەخوێنەپاکەکـەی سـووربون پێغەمبەر(د.خ) فەرموی (اللهم اليك أشـكو ضـعف قـوتی ،وقلـة حيل ،وهوا على الناس،ياأرحم الرا ،أنت رب ا ستضعف وأنت ر ،إ من تكلفي؟إ بعيدٍ يتجهم ؟! أم إ عدوٍ ملكته أمري؟!، (ان لم يكن بك عليّ غضب فلا ابالي، ولكـن عافيتـك اوسـع لـي،**

**اعوذ بنور وجهك الذي اشرقت له الظلمات، وصلح عليه امر الدنيا والاخرة من ان ينزل بی غضبك، او يحل علي سخطك، لك العتبى حتی ترضی،ولاحول ولاقوة الا بالله)**

**واتە: (خودایە بێهێزی خۆم لای تۆدەدرکێنم،چارەم نیەو ناتوانم بەسەر خەڵکیدازاڵ بم،ئەی خاوەن بەزەیی،تۆخودای خەڵکی لاوازی،تۆخودای منی،بۆکێ بەجێم دەهێڵی؟بۆکەسێکی دوور کەگرژومۆن بی لەگەڵم، یابۆدوژمنێك کەکاری منت داوەتە دەست،ئەگەرغەزەبی تۆم لەسەرنەبێ گوێ نادەمێ،بەڵام خۆشبوونی تۆگەلێ فراوانترە،خۆم بەڕوناکی رووی تۆ پە نادەدەم کەتاریکاییەکانی رووناك روناك کردووە،کاروباری دونیاوقیامەتی پێ پێکهات، لەوەی کەتوڕەیی تۆم بەسەربباریێ،یان توشی ئازاری بوونی تۆبێم ،داوای لێخۆشبونت لێ دەکەم تالێم ڕازی دەبی،نەهێزو نەهەوڵ هەیە بێجگەلەوەی کەخودا دەیدا) ئەوەش پاڕانەوەیەکە پڕە لەباوەڕو یەقین وڕازی بوون بەوەی بەسەر پێغەمبەر(د.خ) هاتووە.**

٥٩- کێ بوو پێغەمبەر(د.خ)ی پەنادا، دوای گەڕانەوەی لەتایف بۆئەوەی بچێتەوە مەککە دوای ئەوەی قوڕەیشیەکان نەیان هێشت بچێتەوە مەککە بەهۆی ڕق وکینەیان چونکە پێغەمبەر(د.خ)چوو بووە ثەقیف تاوەکو یارمەتی بدەن؟

**و/موتعەمی کوڕی عەدی پێغەمبەر(د.خ)ی پەنادا.**

٦٠- سەفەری ئیسراومیعراج کەخوای گەورە بە پێغەمبەر(د.خ)ی بەخشی بۆکوێ بوو؟

**و/سەفەری ئیسرا لەمزگەوتی حەرام لەمەککەوە بۆ(بیت المقدس)،میعراجیش لە(المسجدالاقصی)بۆ ئاسمانەبەرزەکان بوو.**

٦١- ئیسراو میعراج مانای چی یە؟

**و/ئیسراء: چوونی پێغەمبەر(د.خ)بەفەرمانی خودا لەمزگەوتی حەرام لەمەککەبۆ(المسجدالاقصی)لەقودس لەکاتی شەودا،میعراجیش:بەرزبونەوەی پێغەمبەر(د.خ) لە (بیت المقدس)لەبەشێکی تری شەو و گەڕانەوەی بۆمەککە لەهەمان شەودا.**

٦٢- ئەو پێغەمبەرانە کێ بوون کە پێغەمبەر(د.خ)لەگەشتی ئیسراو میعراج چاوی پێیان کەوت؟

**و/لەئاسمانی یەکەم ئادەمی بینی لەهی دووەم یحیی وعیسای بینی لەهی سێ یەم یوسفی بینی لەهی چوارەم ئیدریس ولەهی پێنجەم هارون ولەهی شەشەم موساو لەهی حەوتەم ئیبراهیم.سڵاوی خوایان لێ بێ.**

٦٣- پێغەمبەر(د.خ)بەسواری چی ئیسراومیعراجی کرد؟

**و/بەسواری بۆراق.**

٦٤-ئایا ئیسراو میعراج بەجەستەو ڕوح بوو یان تەنیابە ڕوح بوو؟

**و/ئیسراومیعراج بەرۆح و جەستەی پێغەمبەر(د.خ)بوو.**

٦٥-پەیمانی یەکەمی عەقەبە کەی بوو؟ژمارەی ئەوانەی پەیمانیان بە پێغەمبەر(د.خ)دا چەندبوون؟

**و/ئەوانەی پەیمانیان بەپێغەمبەردا دوانزە کەس بوون لەیەثریب (مەدینە) وەهاتبوو.**

٦٦- پەیمانی دووەمی عەقەبە کەی بوو؟ژمارەی ئەوانەی پەیمانیان بە پێغەمبەر(د.خ)دا چەندکەس بوون؟

**و/لەساڵی سێزدەمی پێغەمبەرایەتی بوو،ژمارەی ئەوانەی پەیمانیان بە پێغەمبەر(د.خ)دا حەفتاوسێ پیاوو دوو ئافرەت بوون.**

٦٧- پێغەمبەر(د.خ)کەی موسڵمانەکانی ئیزن دا بۆئەوەی بچنە مەدینە؟

**و/دوای پەیمانی دووەمی عەقەبە کەبەیعەتی(گەورەی عەقەبە)ی پێ دەڵێن،ئیزنی دان بۆئەوەی بچنەمەدینە.**

٦٨-هەڵوێستی موشریکەکان چۆن بوو کاتێ موسڵمانەکان چوونە مەدینە؟

**و/موشریکەکان هەستیان بەترسناکی ئەوکارەکردو بڕیاریاندا کۆبونەوەیەك بکەن وتیایدا ڕێگایەکی گونجاو بۆکوشتنی پێغەمبەر(د.خ)بدۆزنەوە.**

٦٩- موشریکەکان گەیشتنە چ بڕیارێك بۆلەناوبردنی

پێغەمبەر(د.خ)لەدوای کۆچ کردنی موسڵمانان بۆمەدینە ؟کێ خاوەنی بیرۆکەکەبوو؟

**و/بڕیاریاندا کەلەهەرتیرەیەك گەنجێکی بەهێز بێنن و پێغەمبەر(د.خ)بکوژن وخوێنی پێغەمبەر(د.خ)لەهەموو هۆزەکان پەرت ببێ ،بیرۆکەکەش هی ئەبوجەهلی کوڕی هیشام بوو.**

٧٠- چۆن خوای گەورە پێغەمبەر(د.خ)ی لەوپیلانەی موشریکەکان ڕزگارکرد؟

**و/جوبریل وەحی بۆهێنا لەلای خوای گەورە،پیلانی قوڕەیشیەکانی پێ گوت و هەواڵی دایە کەخوای گەورە ڕێگەی پێداوە کەکۆچ بکات .**

٧١- ئەویاوەرەی پێغەمبەر(د.خ)کێ بووکەلەگەڵی چووە مەدینە؟

**و/ئەبوبەکری سدیق.**

٧٢-ئەو یاوەرەی پێغەمبەر(د.خ)کێ بووکە شەوی کۆچ کردن لەجێگایەکەیدا نوست؟

**و/عەلی کوڕی ئەبوتالیب لەجێگای پێغەمبەر(د.خ)نوست.**

٧٣- کۆچکردنی پێغەمبەر(د.خ)لەچ ساڵێکدا بوو؟

**و/ پێغەمبەر(د.خ)لەچوارەمین ساڵی پێغەمبەرایەتی لەمەککە بۆ مەدینە کۆچی کرد.**

٧٤- پێغەمبەر(د.خ)و ئەبوبەکر دوای ئەوەی لەمەککە دەرچوون

لەکوێ خۆیان شاردەوە؟چەندشەو لەوێدامانەوە؟

**و/لەئەشکەوتی ثەور خۆیان شاردەوە،سێ شەولەوێدا مانەوە.**

٧٥- کێ هەواڵی قورەیشیەکانی بۆ پێغەمبەر(د.خ)دەبرد، لەوکاتەی لەئەشکەوتی ثەور بوو؟

**و/عەبدوللای کوڕی ئەبوبەکری سدیق هەواڵی بۆ پێغەمبەر(د.خ)دەبرد.**

٧٦- کێ جێی پێیەکانی عەبدوللای کوڕی ئەبوبەکری دەشاردەوە دوای ئەوەی لەئەشکەوتەکە دەردەچوو؟

**و/عامری کوڕی فەهیرە شوێنی پێیەکانی عەبدوللای کوڕی ئەبوبەکری لادەبر، دبەوەی بەڕانە مەڕێکەوەلەدوای عەبدوللا دەڕۆیشت، بەوشێوەیە جێگای پێیەکانی نەدەما.**

٧٧- کێ ڕێنیشاندەروڕیاوەری پێغەمبەر(د.خ) بوو لەڕێگایاندابۆچوونە مەدینە؟

**و/عەبدوللای کوڕی ئەرقەت بوکەلەموشریکەکانە.**

٧٨- هەڵوێستی قورەیش چۆن بووبەرامبەر کۆچ کردنی پێغەمبەر(د.خ)و ئەبوبەکری سدیق؟

**و/بڕیاریاندا هەموو ئەوڕێگایانەی کەلەمەککەوە دەردەچن بخەنەژێر چاودێری ودیاری سەدحوشتر بدەنەئەو کەسەی کەئەبوبەکرو پێغەمبەریان بۆدەدۆزێتەوەجاچ بەزیندویی بێ یا بەمردوویی.**

٧٩- پێغەمبەر(د.خ)وئەبوبەکر لەڕەشماڵی کامەئافرەت

دابەزین؟ئەوکارەناوازەیەی لەوێ ڕویداچی بوو؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)و ئەبوبەکر لەڕەشماڵی ئوم مەعبەد دابەزین، کارەسەیرەکەش ئەوەبوو کە پێغەمبەر(د.خ)شیرێکی زۆری لەمەڕە لاوازو ووشکەکەی ئوم مەعبد دۆشی.**

٨٠- پێغەمبەر(د.خ)پێش ئەوەی بگاتە مەدینە لەکوێ دابەزی؟و کەی بوو؟

**و/لەقەباءدابەزی،ئەوەش ڕۆژی دووشەمی مانگی ربیعولئەوەل بوو.**

٨١- پێغەمبەر(د.خ)چەند ڕۆژلەقەباء مایەوە؟و لەوێ چی کرد؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)چوار ڕۆژلەقەباء مایەوە،مزگەوتی قەبائی دروست کردو نوێژی تیاکرد.**

٨٢- لەچ ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ)گەیشتەمەدینەی مونەوەرەو لای کێ مایەوە؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)ڕۆژی هەینی گەیشتە مەدینەو چووە ماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنساری.**

٨٣- یەکەم کاری پێغەمبەر(د.خ)دوای ئەوەی گەیشتە مەدینە چی بوو؟

**و/دروست کردنی مزگەوتێك(المسجد النبوی)و هێنانەدی برایەتی ئیسلامی لەنێو موهاجیرەکان وئەنصارەکان ونووسینی بەڵگەنامەیەك**

**بۆڕێکخستنی سیستەمی ژیانی موسڵمانان و خەڵکی دیکە.**

٨٤- پێغەمبەر(د.خ)مزگەوتەکەی لەچ شوێنێك دروست کرد؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)مزگەوتەکەی لەوشوێنە دروست کرد کەیەکەم جا وشترەکەی لێی یخ بوو وزەوییەکەی لەدوو منالی هەتیو کڕیەوە.**

٨٥- صوفە چی یە؟خەڵکەکەشی کێن؟

**و/صوفە: جێگایەکەلەبەشی پشتەوەی مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ)سەری داپۆشراوەو تەنیشتەکانی والأن،خەڵکەکەشی کۆچەرە هەژارەکانن لەو یاوەرانەی کەکەس وکاروجێگایان نیە،میوانی ئیسلامن کەلەمەدینە هیچ جیّ وشوێنێکیان نی یە لەوبەشەی مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ)دەژیان، پێغەمبەر(د.خ)خۆی سەردانی دەکردن ولێی دەپێچانەوەو سەری لەنەخۆشەکانیان دەداو زۆرلەگەڵیان دادەنیشت**

٨٦- یەکەم مەفرەزەی پێغەمبەر(د.خ)ناردی کامەیە؟کەی بوو؟

**و/یەکەم مەفرەزە پێغەمبەر(د.خ) ناردی بەناوی شمشێری دەریا(سیف البحر)بوو لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی یەکەمی کۆچی**

٨٧- پێغەمبەر(د.خ)ئەومەفرەزەیەی بەسەرکردایەتی کێ دەرکرد؟لەپێناوچی بوو؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)ئەومەفرەزەیەی بەسەرکردایەتی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب نارد، بۆئەوەی بەسەرکاروانێکی قوڕەیش دابدەن کەلەشامەوە دەهات.**

٨٨- یەکەم بەیداخ کە پێغەمبەر(د.خ) هەڵیداکامەبوو؟کێ هەڵی گرتبوو؟

**و/یەکەم بەیداخ بەیداخی حەمزەیە لەمەفرەزەی سەیفولبەحرو رەنگی سپی بوو (ئەبو مەرثەدی کەنازکوڕی حوسەینی غەنوی) هەڵی گرتبوو.**

٨٩- یەکەم جەنگی پێغەمبەر(د.خ) چی بوو؟و لەپێناو چی بوو؟

**و/یەکەم جەنگ، جەنگی ئەبوائە یاوەدانە، لە پێغەمبەر(د.خ) و حەفتاپیاو لەکۆچەرەکان دەرچوون بۆ ئەوەی بەسەرکاروانێکی قورەیش دابدەن،بەڵام هیچ شەڕوکوشتارێکی تیاداڕونەدا.**

٩٠- بۆچی پێغەمبەر(د.خ) بۆجەنگی بەدر دەرچوو؟کەی بوو؟

**و/ بۆبەسەردادانی کاروانێکی قورەیشیەکان کەماڵ وساماتێکی زۆری خەڵکی مەککەی تێدابوو،لەحەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی بوو.**

٩١- ژمارەی موسڵمانەکان لەجەنگی بەدرچەند بوو؟ ژمارەی کافرەکان چەندبوو؟

**و/ژمارەی موسڵمانەکان سێ سەدوسێزدە جەنگاوەرو ژمارەی کافرەکانیش هەزار جەنگاوەر بوو.**

٩٢- کێ ئالای موسڵمانانی هەڵگرتبوو لەجەنگی بەدردا؟

**و/موصعەبی کوڕی عومەیر ئالای موسڵمانانی هەڵگرتبوو، ڕەنگی**

**ئاڵاکەش سپی بوو.**

٩٣- پێغەمبەر(د.خ) چ ڕێگایەکی نوێی دۆزیەوە بۆشەڕکردن لەگەڵ کافرەکان لەجەنگی بەدردا؟

**و/ڕێگای شەڕکردن بەشێوەیەك بوو جەنگاوەرەکان ڕیزڕیزبوەستن وەکو نوێژ ئەوڕیزانەش بەگوێرەی ژمارەی جەنگاوەرەکان زیادو کەم دەبن، ڕیزی یەکەم ئەوانەن کەڕمیان پێیە بۆبەرەنگاربونەوەی هێرشەکانی سوارەکان و ڕیزەکانی دوای ئەوانیش تیرو کەوانیان پێیە بەم شێوەیە.**

٩٤- سەوادی کوڕی غەزیە کێیە؟و بەسەرهاتەکەی چۆن بوو؟

**و/سەوادی کوڕی غەزیە ئەو یاوەرەیە کەلەوکاتەی پێغەمبەر(د.خ)ڕیزی موسڵمانەکانی ڕێك دەخست لەڕێزهاتبووە دەرەوە، پێغەمبەریش تیرێکی بێ پەری پێبوو لەزگی سەوادی داو پێی وت (لەگەڵ ڕێزەکە ڕێککەوە سەواد) سوادیش وتی ئەی پێغەمبەری خودا زگمت یەشاند خوای گەورەتۆی بەهەق ویەکسانی ڕەوانکردووە جاتۆڵەم بۆبکەوە، پێغەمبەر(د.خ)یش زگی خۆی بۆدەرخست وفەرمووی تۆڵەی خۆت بکەوە سەوادیش زگی پێغەمبەری ماچ کرد، پێغەمبەر(د.خ)یش گووتی بۆچی وات کرد؟سەواد گووتی:ئەی پێغەمبەری خوداهەردەم ویست لەدواساتدا پێستم بەپێستت بکەوێت،پێغەمبەریش دوعای خێری بۆکرد.**

٩٥- ئەویاوەرە کێ بوو کەچاکترین جێگای پیشانی

پێغەمبەر(د.خ)دا بۆئەوەی سوپای بەدری لێ دابنرێ؟

**و/ئەویاوەرە حوبابی کوڕی مونزیرە بوو.**

٩٦- کێ سەرۆکی سوپای کافرەکان بوولەجەنگی بەدردا؟

**و/ئەبوجەهلی کوڕی هیشام.**

٩٧- قەلیبیەکان کێن؟

**قەلیبیەکان ئەوکوژراوە کافرانەن سەرۆکی قورەیش وگەورەپیاوانیانن، قەلیبیش ئەوبیرەیە کەئاوی ووشك کردووە، پێغەمبەر(د.خ)فەرمانی دا کوژراوە هاوبەش پەرستەکانی بخەنە ناو بیرەکە دوای تەواوبونی جەنگی بەدر، پێغەمبەر(د.خ)لەسەریان وەستاو فەرمووی (خراپترین خێلی پێغەمبەربوون بۆ پێغەمبەرەکەتان، بەدرۆتان خستمەوەو خەڵکی باوەڕیان پێکردم، شەرمەزارتان کردم، خەڵك سەری خستم ،دەرتان کردم ،خەڵکی داڵدەیان دام)دوای ئەوە ڕاکێشرانە ناو بیری قەلیبی بەدر.**

٩٨- ژمارەی شەهیدە موسڵمانەکان وکوژراوو دیلەکانی کافرەکان چەندبوون لەجەنگی بەدردا؟

**و/ژمارەی شەهیدەموسڵمانەکان چواردەکەس بوون،ژمارەی کوژراوە کافرەکانیش حەفتاکەس و دیلەکانیشیان حەفتاکەس بوون.**

٩٩- ئەوسورەتەی قورئان کەباسی جەنگی بەدر دەکات کامەیە؟

**و/سورەتی ئەنفال.**

١٠٠- خوای گەورە چی بۆجەنگاوەرە موسڵمانەکان ناردلەجەنگی بەدردا؟

**خوای گەورە فریشتەی بۆموسڵمانان نارد لەجەنگی بەدرو لەگەڵ موسڵمانەکان شەڕیان دژی کافرەکان کردو زۆریان لێ کوشتن تاوەکو سەرکەوتن.**

١٠١- جەنگی بەنی قەینوقاع کەی بوو؟

**و/لەنیوەی مانگی شەوالی ساڵی دووەمی کۆچی ڕویدا.**

١٠٢- هۆی بەرپابوونی جەنگی بەنی قەینوقاع چی بوو؟

**ئەوجەنگە بەهۆی ئەوەڕویداچونکە جولەکەکانی بەنی قەینوقاع ئەوپەیمانەیان شکاند،کەلەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)بەستبویان وئازاری موسوڵمانەکانیان دەدا.**

١٠٣- لەشەڕی بەنی قەینوقاع کێ بەیداغی موسوڵمانانی هەڵگرتبوو؟

**و/حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب.**

١٠٤- جەنگی بەنی قەینوقاع چۆن کۆتایی هات؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)بۆماوەی پازدەڕۆژ جولەکەکانی گەمارۆدا لەقەڵاکەیانداو دوای ئەوەی خوای پەروەردگار ترسی خستە دڵیان، ئینجا ترسان و تەسلیمی پێغەمبەر(د.خ)بوون.**

١٠٥- جەنگی ئوحود کەی ڕویدا؟

**و/لەحەفتی شەوالی ساڵی سێ یەمی کۆچی ڕویدا.**

١٠٦- ژمارەی سوپای موسوڵمانان وسوپای هاوبەش پەرستان چەندبوو لەجەنگی ئوحود؟

**و/ژمارەی سوپای موسوڵمانان حەفسەدجەنگاوەرو ژمارەی سوپای هاوبەش پەرستان سێ هەزار جەنگاوەربوون.**

١٠٧- ناوی ئەومونافیقەی لەشەڕ هاتەدەرەوە لەگەڵ سێ سەدمونافیقی تر چی بوو، بەبیانووی ئەوەی شەڕ ڕوونادا لەگەڵ هاوبەش پەرستان و گوتی پێغەمبەر(د.خ)بەقسەی منداڵانی کردو قسەی منیشی شکاند؟

**و/ناوی: عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو، دوڕم وو(منافق)بوو ئەوکارەشی بۆئەوەکرد تاوەکوسوپای موسوڵمانان بشێوێنێ.**

١٠٨- پێغەمبەر(د.خ)سوپاکەی چۆن دابەش کردلەجەنگی ئوحوددا؟

**و/دابەشی سەرسێ کەتیبەی کردن:**

**١-کەتیبەی کۆچەرەکان، بەیداخەکەشی لای موصعەبی کوری عومەیر بوو.**

**٢-كەتیبەی ئەوس لەئەنصارەكان،بەیداخەكەشی لای ئەسیدی كوڕی حوضەیر بوو.**

**٣-كەتیبەی خەزرەج لەئەنصارەكان وبەیداخەكەش لای خوبابی كوڕی مونزیر بوو.**

١٠٩- بۆچی پێغەمبەر(د.خ)هەندێك لەیاوەرەكانی ناردەوە لەشەڕی ئوحود بەشداری پێنەكردن؟ ژمارەیان چەند بوو؟

**و/لەبەرئەوەی تەمەنیان بچوك بوو لەخوارچواردە ساڵی بوو، لەوانەش(عەبدوللای كوڕی عومەر،زەیدی كوڕی سابت،ئوسامەی كوڕی زەید،زەیدی كوڕی ئەرقەم،ئەبوسەعیدی خودری) ژمارەیان چواردەهەرزەكار بوون.**

١١٠- كێ سەرۆكایەتی سوپای كافرەكانی دەكرد لەجەنگی ئوحود؟

**و/سەرۆكایەتی گشتی ئەبوسوفیانی كوڕی حەرب دەیكردو سەرۆكایەتی سوارەكانیش خالیدی كوڕی وەلیدو عەكرەمەی كوڕی ئەبو جەهل؟**

١١١- هۆی گۆڕانی سەركەوتنی موسوڵمانان بۆدۆڕان چی بوو، لەجەنگی ئوحود دا؟

**و/لەبەرئەوەی تیرهاوێژەكان جێگای خۆیان بەرداو فەرمانی پێغەمبەریان (د.خ) شكاند.**

١١٢- موسوڵمانەكان لەجەنگی ئوحود چ پەندێكیان وەرگرت؟

**و/زانیان دەبێ گوێڕایەڵی پێغەمبەر(د.خ)بن وفەرمانەکانی جێ بەجێ بکەن.**

١١٣- ناخۆشترین شت کەبەسەر موسوڵمانەکان هات لەجەنگی ئوحودچی بوو؟

**و/بڵاوبونەوەی دەنگۆی کوژرانی پێغەمبەر(د.خ)بوو.**

١١٤- ژمارەی شەهیدە موسوڵمانەکان و کافرە کوژراوەکان چەندبوو؟

**و/ژمارەی شەهیدی موسڵمانان حەفتاشەهید بوو، ژمارەی کوژراوە کافرەکان سی وحەفت کوژراو بوو دەشڵێن بیست ودوو بوون.**

١١٥- ئەوجەنگەی پێغەمبەر(د.خ)کردی بۆڕاونانی سوپای مەککە کاتێك لەئوحود دەگەڕانەوە ناوی چی بوو؟ بۆچی کرا؟

**و/ناوی جەنگی حەمرائولئەسد بوو، بەو مەبەستەی، تاوەکوهاوبەش پەرستان تام وچێژلەسەرکەوتنەکەیان نەکەن وبیر لەوەنەکەنەوە هێرش بەرنە سەرمەدینە.**

١١٦- کەی پێغەمبەر(د.خ)دەرچو بۆجەنگی حەمرائولئەسد؟کێی لەگەڵ بووله موسوڵمانەکان؟

**و/یەکسەردوای گەڕانەوەیان لەجەنگی ئوحود دەرچوون بۆحەمرائولئەسد هەشتی شەوال بوو، پێغەمبەر(د.خ) مەرجی دانا، دەبێ**

**تەنهائەوانە لەگەڵی بچن کەلەجەنگی ئوحود دا بەشداربوون.**

١١٧- جەنگی حەمرائولئەسد چ ئاکامێکی هەبوو؟

**و/ئەبوسوفیان وهاوبەش پەرستان ترسان وگەڕانەوە مەککە، موسوڵمانەکانیش بەبێ شەڕکردن گەڕانەوە مەدینە.**

١١٨- لەکام سورەتێکی قورئاندا باسی جەنگی ئوحود کراوە؟

**و/لەسورەتی(آل عیمران)**

١١٩- باسی هەندێ روداوی ناخۆش بکە کەتوشی موسوڵمانان بوو، دوای جەنگی ئوحود.

**و/لەڕوداوە ناخۆشەکانی کەتوشی موسوڵمانەکان بو:کوژرانی دە موسوڵمان لەشوێنێك کەپێی دەوترێ (ئەلرەجیع) وکوژرانی حەفتاکەس لەپیاوچاکانی موسوڵمانان لەبیری مەعونە، بەفێڵو تەڵەکەبازی لەدووکاتی جیاوازدا.**

١٢٠- خەڵکانی رەجیع کێن لە قورئان زانەکان؟

**و/ئەوحەفتا یاوەرە ئەنساریەن کە پێغەمبەر(د.خ)وەکو مامۆستا وشارەزا ناردیانی بەڵام کوژران وفێڵیان لێکرا لەقەسابخانەیەکی نامەردانەدا لەلایان هاوپەیمانانی هوزەیل شەهیدکران.**

١٢١- هۆی ڕودانی جەنگی بەنی نەضیرچی بوو؟

**و/هۆیەکەی ئەوڕوداوە بوو کەبەسەر موسوڵمانان هات لەرەجیج و بیری مەعونە، چونکە جولەکەی بەنی نەضیر هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریاندا،**

**ویستیان بەردە دەستارێك بەسەری پێغەمبەر(د.خ)دابدەن.**

١٢٢- جەنگی بەنی نەضیر کەی ڕویدا؟

**و/لەڕەبیعولئەوەلی ساڵی چوارەمی کۆچی.**

١٢٣- جەنگی بەنی نەضیر چۆن کۆتایی هات؟

**و/موسوڵمانەکان بۆماوەیەك دەوری قەڵای جولەکەکانیان داو خوداش ترسی خستەدڵی جولەکەکان، وچەکیان داناو مەدینەیان چۆل کرد.**

١٢٤- لەکام سورەتی قورئاندا باسی جەنگی نەضیر کراوە؟

**و/لەسورەتی ئەلحەشر**

١٢٥- جەنگی دەومەتولجەندەل کەی ڕویدا؟ ئامانجەکەی چی بوو؟

**لەڕەبیعولئەوەلی ساڵی پێنجەمی کۆچی ڕویدا،ئامانجیش لەوشەڕە ئەوەبوو کەڕووبەڕووی ئەوعەرەبانەببنەوە کەلە دەومەتولجەندەل ڕێگری دەکەن و هەرکاروانێك بەویٚ ڕەت بیٚ تالاٚنی دەکەن و نیازیشیان هەبوو بەسەر مەدینەدابدەن.**

١٢٦- ژمارەی سوپای موسوڵمانەکان لەدەومەتولجەندەل چەند جەنگاوەربوون ئەوجەنگە چۆن کۆتایی هات؟

**و/ژمارەیان هەزار جەنگاوەربون،بەبیٚ شەڕکردن کۆتایی هات.**

١٢٧- ئەو یاوەرەناوی چی بوو، کاتیٚ ڕمێکی لەپشتی دراو لەسینگی

هاتە دەرەوەو، گوتی{بەخوای کەعبە بردمەوە)؟

**و/هاوەڵی پایەدارحەرامی کوڕی میلحان بوو.**

١٢٨- دایکی هەژاران کێیە؟

**و/زەینەبی کچی حوزەیمە ی دایکی موسوڵمانانە لەسەردەمی جاهیلیەت پێیان دەوت دایکی هەژاران چونکە نانی دەدا هەژاران و لەساڵی دووەمی کۆچی پێغەمبەر(د.خ)خواستی.**

١٢٩- ئەو ئافرەتە یاوەرە ناوی چی بوو، کەلەگەڵ مێردەکەی کۆچی کرد بۆحەبەشە بەهۆی موسوڵمان بوونی، دوای ئەوەی گەڕانەوە مەککەو دوای کۆچ کردنی پێغەمبەر(د.خ)بۆمەدینە، ئەوانیش کۆچیان بۆمەدینە کردو دوای کوژرانی پیاوەکەی پێغەمبەر(د.خ)خواستی.

**و/دایکی موسڵمانان ئوم سەلەمە بوو.**

١٣٠- جەنگی ئەحزاب کەی ڕوویدا؟

**و/لەمانگی شەوالی ساڵی پێنجەمی کۆچی.**

١٣١- هۆی ڕوودانی جەنگی ئەحزاب چی بوو؟

**و/ئەوجەنگە بەهۆی هاندانی بیست لەگەورەی جولەکەکانی مەدینە بوو بۆقورەیشیەکان وتیرەعەرەبەکان بۆئەوەی بەسەر مەدینەدا بدەن.**

١٣٢- ژمارەی سوپای ئەحزاب چەند بوو کەلەدەوری مەدینەکۆببونەوە؟ژمارەی موسوڵمانەکان چەندبوو؟

**و/ژمارەی سوپای ئەحزاب دەهەزار جەنگاوەرو ژمارەی سوپای موسوڵمانان سێ هەزار جەنگاوەربوون.**

١٣٣- ئەو پلانە چی بوو کەموسوڵمانەکان بۆپارێزگاری کردنی مەدینە دایاننا؟کێ خاوەنی پیلانەکە بوو؟

**و/پیلانی موسوڵمانان ئەوە بوو کەچاڵ لەدەورەی مەدینە هەڵکەنن و پلانەکەش هی سەلمانی فارسی بوو.**

١٣٤-ژمارەی ئەو موسوڵمانانەی کەبەشداریان لەچاڵ هەڵکەندن کرد چەندبوو؟

**و/ژمارەیان هەزارموسوڵمان بوو.**

١٣٥-باسی هەندێك لەوموعجیزانەی پێغەمبەر(د.خ)بکە کەلەکاتی هەڵکەندنی چاڵەکە ڕوویدا؟

١-خواردنی کەم زۆر بوو

٢- پێغەمبەر(د.خ)مـوژدەی بەموسوڵمانانـدا، ولاتی شام وفارس ویەمەن ڕزگاردەکەن

**١٣٦-ناخۆشترین شت چی بوو کەلە جەنگی ئەحزاب توشی موسوڵمانان بوو؟**

**و/ناخۆشترین ڕووداو خیانەت کردنی جولەکەکانی بەنی قورەیزە بوو، کەلەگەڵ هاوبەش پەرستان دژی موسوڵمانان وەستان.**

١٣٧- جەنگی ئەحزاب چۆن کۆتایی هات؟

**و/بەبێ شەڕکردن کۆتایی هات، سوپای ئەحزاب گەڕانەوە، دوای ئەوەی ناکۆکی کەوتە سوپای دوژمن وبەفەرمانی خوای گەورە ڕەشەباوگەردەلولێکی زۆر سارد هات وهەموو ڕەشماڵ وخێوەتەکانیانی تێکدا، هەروەها خوای گەورەچەند فریشتەیەکی دابەزاند، بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی دوژمنان.**

١٣٨- ژمارەی موسوڵمانە شەهیدەکان وکوژراوی هاوبەش پەرستان لەجەنگی ئەحزاب چەندبوو؟

**و/ژمارەی موسوڵمانە شەهیدەکان شەش شەهیدو هی هاوبەش پەرستان دەکەس بوون کەزۆریان بەڕم کوژران.**

١٣٩- جەنگی بەنی قورەیزە کەی ڕویدا؟

**و/هەرئەو ڕۆژەی پێغەمبەر(د.خ)لەجەنگی ئەحزاب گەڕایەوەخوای گەورە ئەمری پێ کردکەلەگەڵ بەنی قورەیزە بجەنگێ.**

١٤٠- هۆی چی بوو کە پێغەمبەر(د.خ)گەمارۆی بەنی قورەیزەی دا؟

**و/چونکەپەیمانیان شکاندلەگەڵ موسوڵمانان ولای هاوبەش پەرستانیان گرت ، لەجەنگی ئەحزابدا.**

١٤١-ژمارەی سوپای موسوڵمانەکان چەند بوو کەلەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)دەرچوون بۆگەمارۆدانی بەنی قورەیزە؟

**و/ژمارەيان سێ هەزار جەنگاوەر بوون.**

١٤٢-جەنگی بەنی قورەيزە چۆن کۆتايی هات؟

**و/بەتەسليم بوونی جولەکەکان کۆتايی هات.**

١٤٣- ئـەوياوەرەکێ بـوو کـەحوکمی لەسـەر جولەکـەکانی بـەنی قورەيزە کردو حوکمەکەشی چی بوو؟

**و/ياوەرەکـە سـەعدی کـوڕی مـەعازبوو، حوکمەکەشـی ئـەوەبوو کـەپياوەکانيان بکـوژرێن وژن ومناڵەکانيـشيان بمێـنن ومـاڵ وسامانەکەشيان دابەش بکرێت.**

١٤٤-ژمـارەی موسـوڵمانە شـەهيدبووەکان و کـوژراوە جولەکـەکانی بەنی قورەيزە چەندبوو؟

**و/ژمارەی موسوڵمانە شـەهيدکراوەکان دوو شـەهيدوژمارەی کـوژراوە جولەکەکانيش لەنێوان شەشسەدتا حەفتسەد پياو بوون.**

١٤٥-ئەوسورەتەی قورئـان کامەيەباسـی جـەنگی ئـەحزاب وجـەنگی بەنی قورەيزە دەکات؟

**و/سورەتی(الاحزاب)**

١٤٦-دايکی موسوڵمانان کەخوای گەورەبە پێغەمبەر(د.خ)ی بەخشی لەسەرەوەی حەوت ئاسمانان ناوی چی بوو؟

**و/زەينەبی کچی جەحش.**

١٤٧-زەینەبی دایکی موسوڵمانان پێش ئەوەی پێغەمبەر(د.خ)ناوی بگۆڕێ ناوی چی بوو؟

**و/ناوی بەررە بوو.**

١٤٨-ناوی ئەویاوەرەچی بوو زەینەبەی کچی جەحش مێردی پێکردوو دوای ئەوەتەڵاقی داو پێغەمبەر(د.خ)هێنای؟

**و/ناوی یاوەرەکە زەیدی کوڕی حاریثە بوو.**

١٤٩-ناوی ئەوخێزانەی پێغەمبەر(د.خ)چی بوو، کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی دەستڕۆیشتوو ترە لەخێزانەکانی تر؟

**و/زەینەبەی کچی جەحش بوو بەدەستی خۆی کاری دەکردوو خێری دەکرد.**

١٥٠- هۆی چی بو پێغەمبەر(د.خ)زەینەبی کچی جەحشی دایە زەیدی کوڕی حاریثەو دوای ئەوەی تەلاقیدا، پێغەمبەر(د.خ)خۆی هێنای؟

**و/هۆیەکە نەهێشتنی دیاردەی تەبەننی(بەکوڕی خۆکردن)کەلەکاتی نەزانیدا باوبوو.زەیدی کوڕی حاریث غولامێکی پێغەمبەر(د.خ)بوو کەبەخێوی کردبوو دوای ئەوەئازادی کردوکردیە کوڕی خۆی، وای لێهاتبوو خەڵکی دەیانگوت زەید کوڕی موحەمەدە،دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ)کچی پلکی خۆی دایێ، کەزەینەبی کچی جەحش بوو، دوای ئەوەی زەید تەلاقی دا، پێغەمبەر(د.خ) مارەی کرد موشریکەکان**

**دەیانگوت: موحەمەدخێزانی کوڕەکەی خۆی هێناوە!**

١٥١- بۆچی پێغەمبەر(د.خ)جەنگی بەنی لیحیانی بەرپاکرد؟

**و/بۆ کوشتاری بەنی لیحیان کەدە یاوەریان کوشتبوو لە رەجیع.**

١٥٢-جەنگی بەنی لیحیان کەی بەرپابوو ژمارەی سوپای موسوڵمانان چەند کەس دەبوون؟

**و/لەساڵی شەشەمی کۆچی بوو،ژمارەی جەنگاوەرەکانیش دووسەد کەس بوون.**

١٥٣- جەنگی بەنی لیحیان چۆن کۆتایی هات؟

**و/بەراکردنی بەنی لیحیان بۆسەر لوتکەی چیاکان، کەزانیان سوپای موسوڵمانان هاتووە لەگەڵیان بجەنگێ.**

١٥٤- جەنگی(بني المُصْطَلق)کەی ڕویدا؟

**و/لەشەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچی.**

١٥٥- هۆی ڕوودانی جەنگی(بني المُصْطَلق)چی بوو؟

**و/هۆیەکەئەوە بوو، پێغەمبەر(د.خ)پێی گەیشت کەسەرۆکی (بنی المصطلق)کەحاریثی کوری ئەبی ضیرار بوو، لەگەڵ قەومەکەی و ژمارەیەك لەعەرەبەکان دەیانەوێ بەسەر پێغەمبەر(د.خ)دابدەن، پێغەمبەر(د.خ)یش بریاریدا بۆیان دەرچێ.**

١٥٦-جەنگی (بنی المُصْطَلق)چۆن کۆتایی هات؟

**و/بەدۆڕانی(بنی المصطلق)و سەرکەوتنی موسـولّمانەکان و جێهێـشتنی ماڵ وسامان وئافرەتەکانیان.**

١٥٧-هۆی چی بـوو پێغەمبـەر(د.خ)و یاوەرەکـانی لەسـاڵی شەشـەمی کۆچی چوونە مەککە؟

**و/چونکە پێغەمبەر(د.خ)لەخەونیدا بینی کەخۆی ویاوەرەکانی چـونەتە مزگەوتی حەرام بۆ عیمرەهێنانەوە، دوای ئەوە بڕیاریدابـچێتە مەککـە، بۆهێنانەوەی عیمرە لەگەڵ یاوەرەکانی.**

١٥٨-ژمـارەی ئـەو موسـولّمانانەی لەگـەڵ پێغەمبــەر(د.خ) چـوون بۆعیمرە کردن چەندبوون؟

**و/پێغەمبــەر(د.خ) لـەمانگی ذی القعـدە دەرچـوو نزیکـەی هـەزارو چوارسەد یاوەریشی لەگەڵ دابوو.**

١٥٩-هەڵوێستی قوڕەیـشیەکان چۆن بووکـەزانیان پێغەمبـەر(د.خ)و یاوەرەنی بۆمەککە دەرچوون؟

**و/قورەیشیەکان بڕیاریاندا بەرەنگاری موسوڵمانەکان ببنەوەو دووسـەد سواریان ئامادەکرد بەسەرۆکایەتی خالیـدی کـوڕی ولیـدبۆ لێـدانی موسوڵمانەکان.**

١٦٠-بۆچی پێغەمبەر(د.خ)لەحودەیبیە وەستاو نەچووە مەککە؟

**و/چونکە وشترەکەی پێغەمبەر(د.خ) (ئەلقەصواء ) لەوێ چـۆکی داوەو**

**یـخ بـوو، یاوەرەکـانیش ئەمـەیان زۆرپـێ نـاخۆش بـوو وهەوڵیانـدا هەڵیستێنەوەو ڕۆیشتنەکەیان بۆمەککە تەواو کەن، کەچی خوای گـەورە ئەوەی نەویست!.**

١٦١- پێغەمبـەر(د.خ)و یاوەرەکـانی چـیان کـرد بۆئـەوەی خۆیـان لەخالیدی کوڕی وەلیدو سوپاکەی لادەن؟

**و/ڕێگایەکی نهێنیان گرتەبەرو لەحودەیبیە لایاندا.**

١٦٢- قورەیـــشیەکان چـــیان کردکـــاتێ پێغەمبـــەر(د.خ)چـــووە حودەیبیە؟

**و/نوێنەرانیان بۆلای پێغەمبەر(د.خ) نارد، بۆ ئەوەی بزانن بۆچی هاتۆتە مەککە.**

١٦٣- پێغەمبەر(د.خ) چۆن وەڵامی نوێنەرەکانی دایەوە.

**و/پێغەمبەر(د.خ)سێ خاڵی بۆدانان:١-ئەگەر بیانەوێ پێغەمبـەر(د.خ) لەگەڵیان پێك دێتەوەو ڕێگای پێبدەن بانگیان بکا بۆئیسلام.**

**٢- وەکو خەڵکی تربێنەناو ئایینی ئیسلام**

**٣-ئەگەرناڕازیش بن ناچاردەبێ شەڕیان لەگەڵ بکا.**

١٦٤-هۆی ڕوودانی بەیعەتی ریضوان چی بوو؟

**و/هۆیەکە ئەوەبوو کە پێغەمبەر(د.خ) عوسمانی کوڕی عـەفانی نـاردە لای قورەیشیەکان بۆئەوەی هـۆی چـوونیان بۆمەککـە ڕوون بکاتـەوە،**

**بەڵام قورەیشیەکان بەندیان کردو ئەو هەواڵە بڵابووەوە کەگوایە عوسمان کوژراوە جا پێغەمبەر(د.خ) داوای لەموسوڵمانەکان کردبەیعەتی پێ بدەن تامردن بۆئەوەی تۆڵەی عوسمان بکاتەوە.**

١٦٥- موسوڵمانەکان چەند لەحودەیبیە مانەوە؟

**و/موسوڵمانەکان دەدوازدە ڕۆژێك لەحودەیبیە مانەوە،لەگوتەیەکی تریش بیست ڕۆژ.**

١٦٦- قورەیشیەکان مەرجیان چی بوو بۆئەوەی پەیمان لەگەڵ موسوڵمانان ببەستن؟

**و/مەرجیان ئەوەبوو کە پێغەمبەر(د.خ) بگەڕێتەوەو ئەوساڵە نەچێتە مەککە.**

١٦٧- ئەوبەندانە چی بوون کەقورەیشیەکان و موسوڵمانەکان لەسەری ڕێککەوتن؟

**١- پێغەمبەر(د.خ) ئەوساڵەی بگەڕێتەوەو نەچێتە مەککە ساڵی دوای بچێتە مەککە بۆحەج کردن**

**٢- ئەوی حەزی لێبێت ببێتە هاوپەیمانی موحەمەد یان قورەیش، ئەواخۆی هەڵیدەبژێت و ئازادە**

**٣- هەرکەسێ لەقورەیش بێتەلای موحەمەد دەبێ بینێرێتەوە مەککە وهەرموسوڵمانێك بێتەلای قورەیش ناگەڕێتەوە لای موحەمەد**

**٤- دەساڵ جەنگ لەنێوانیان دەوەستێت**

١٦٨- ئەویاوەرەکێ بوو کەدوای موسوڵمان بوونی پێغەمبەر (د.خ) ناردیە لای هاوبەش پەرستان دوای سولحی حدەیبیە؟

**و/ئەو یاوەرە ئەبو بەصیرعوتبەی کوری ئەسید بوو کەلەزیندانەکانی مەککەوە هەلأت و چوو بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەر(د.خ).**

١٦٩- هەنگاوی دوای پەیمان بەستنی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ قورەیشیەکان چی بوو؟

**و/دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) .نامەی بۆپاشاو سەرۆکەکان ناردو بانگەوازی ئیسلامی کردن.**

١٧٠- بۆچی پێغەمبەر(د.خ) مۆرێکی تایبەت بەخۆی دانا؟شێوەی ئەومۆرە چۆن بوو؟

**و/چونکە زانی سەرۆکەکان هیچ نامەیەك بەبێ ئەوەی مۆری لەسەربێ وەرنا گرن بۆیەمۆرێکی لەزیوی دانا، تایبەت بێ بەخۆی بەشێوەی (محمدرسول الله)نەخشێندرابوو.**

١٧١- پێغەمبەر(د.خ) کەی نامەی بۆپاشاو سەرۆکەکان نادر بۆئەوەی بانگەوازی ئیسلامیان بکات؟

**و/لەمانگی موحەرەمی ساڵی حەفتەمی کۆچی بوو.**

١٧٢- پێغەمبەر(د.خ)نامە بۆکام لەپاشاکان ڕەوانەکرد؟

**و/نەجاشی پاشای حەبەشەو موقەوقەس پاشای میسرو کیسرای پاشای**

**فارس وقەیسەری پاشای ڕۆم وجەیفەری پاشای عومان و مونزیری کوڕی ساوی فەرمانڕەوای بەحرێن و هەوزەی کوڕی عەلی خاوەنی یەمامەو الحارثی کوڕی ئەبی شیمری غەسانی خاوەنی دیمەشق.**

١٧٣-جەنگی خەیبەر کەی ڕویدا؟

**و/لەمانگی موحەرەمی ساڵی حەفتەمی کۆچی ڕویدا.**

١٧٤-هۆی ڕودانی جەنگی خەیبەر چی بوو؟

**و/چونکە پێغەمبەر(د.خ)دەیویست تۆڵەی موسوڵمانان لەجولەکەکان بکاتەوە، کە ڕق وکینەیان بەرامبەر موسڵمانان لەدڵ بوو.**

١٧٥ژمارەی جەنگاوەرە موسوڵمانەکان لەجەنگی خەیبەر چەند بوو؟

**و/ژمارەیان هەزاروچوارسەدجەنگاوەر بوو.**

١٧٦-ئەویاوەرەکێ بووکەجێگای کۆبوونەوەی سوپای خەیبەری پیشانی پێغەمبەر(د.خ)دا؟

**و/حوبابی کوڕی مونزیر بوو.**

١٧٧-کێ ئاڵای موسوڵمانانی هەڵگرتبوو لەجەنگی خەیبەر؟

**و/عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاڵای موسوڵمانانی هەڵگرتبوو.**

١٧٨-جولەکەکان چەندقەڵای سەرەکیان هەبوو لەخەیبەر؟

**و/هەشت قەڵای سەرەکیان هەبوو.**

١٧٩-جەنگی خەیبەرچۆن کۆتایی هات؟

**و/موسـوڵمانەکان بـەهۆی شـەڕکردن لەگـەڵ جولەکـەکان چـەند قەلایەکیان گرتو ژمارەکەی تریش تەسلیم بـوون و پـەیمانیان لەگـەڵ پێغەمبەر(د.خ)بەست.**

١٨٠-ژمـارەی شـەهیدەکانی موسـوڵمانان وکوژراوەکـانی جولەکـەکان چەندبوو لەخەیبەر؟

**و/ژمارەی شەهیدەکانی موسوڵمانەکان شازدەتانۆزدە شەهیدو ژمارەی کوژراوە جولەکەکانیش نۆوەدوسێ کوژراو بوو.**

١٨١-ئـەویاوەرە کێ بـوو کەلەحەبەشـەوە هاتـە لای پێغەمبـەر(د.خ) لەخەیبەرو پێغەمبەریش زۆرخۆشحال بوو بەهاتنەوەی؟

**و/جەعفـەری کـوڕی ئـەبی تـالیبی ئـامۆزای دوای ئـەوەی دەسـاڵ بـەئاوارەیی لەحەبەشـە ژیاوچووەخەیبەردەسـتی کردەملـی جەعفـەرو ماچی کردوفەرمووی (نـازانم بـەکامیان دڵـم خۆشـترە، بەهاتنـەوەی جەعفەر یان گرتنی خەیبەر.**

١٨٢-جەنگی(ذات و الريقاع )کەی ڕویدا؟

**و/لەساڵی حەفتەمی کۆچی ڕویدا.**

١٨٣-ئامانج چی بوو لەجەنگی (ذات ولريقاع) ؟

**و/بۆتۆلەسـەندنەوە لەوعەرەبانـەی کـە شـەڕیان بەموسـوڵمانەکان دەفرۆشت وڕێگریان دەکرد.**

١٨٤- ژمارەی سوپای موسوڵمانان چەندبوو لەجەنگی ذاتوالریقاع؟

**و/ژمارەیان چوارسەد یاحەفت سەد جەنگاوەربوو.**

١٨٥-جەنگی ذات ولریقاع چۆن کۆتایی هات؟

**و/بەکۆبونەوە لەگەڵ غە طفان و ڕاگرتنی جەنگ لەنێوانیان.**

١٨٦-کەی پێغەمبەر(د.خ)و یاوەرانی دەرچوون بۆ بەجێگەیاندنی عومرەی قەزا؟

**و/لەمانگی ذي القعدەی ساڵی حەوتەمی کۆچی.**

١٨٧-ژمارەی موسوڵمانەکانی بۆ عومرە چووبوون چەند بوو؟

**و/دووهەزار موسوڵمان بوون خەڵکی حودەیبیەشی لەگەڵ بوو.**

١٨٨-پێغەمبەر(د.خ)چەند ڕۆژلەمەککە مایەوە لەکاتی بەجێگەیاندنی عومرەی قەزا؟

**و/سێ ڕۆژ مانەوە.**

١٨٩-بۆچی ناوی لێنرا عومرەی قەزا؟

**و/چونکە بڕیاربووساڵی پێشتربچن بەلاّم بەهۆی سولحی حودەیبیە بڕیاردرا ساڵی دابێ بچن بۆعومرە.**

١٩٠-جەنگی موئتە کەی ڕویدا؟

**و/لەجەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچی.**

١٩١-هۆی ڕودانی جەنگی موئتەچی بوو؟

**و/چونکە شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی کەکار بەدەستی**

**ڕۆمـــەکان بـــوو، حـــاریثـــی کـــوڕی عـــەمیری ئـــەزەدی پەیامبـــەری پێغەمبەر(د.خ)ی شەهید کرد.**

١٩٢-ژمـــارەی ســـوپای موســـوڵمانەکان چـــەندبوو لەجـــەنگی موئتە؟ژمارەی سوپای ڕۆمەکان وهاوپەیمانەکانیان چەندبوو؟

**و/ژمارەی موسوڵمانەکان سێ هەزارجەنگاوەر بوو،ژمـارەی ڕۆمـەکان وهاوپەیمانەکانیش دووسەدهەزار جەنگاوەربوو.**

١٩٣-کێ ئەمیری سوپای موئتەبوو؟

**و/زەیدی کوڕی حاریسە، ئەگەرئەویش کوژرا جەعفەری کـوڕی ئـەبی تالیب، ئەگەر جەعفەریش کوژراعەبدوللای کوڕی رەواحە.**

١٩٤-ئـــەویاوەرەکێ بـــوو کەســـەرۆکایەتی موســـوڵمانانی کـــرد دوای شەهیدبوونی سێ سەرۆکەکەی پێغەمبەر(د.خ)نیشانی کرد؟

**و/خالیدی کوڕی وەلید سەرۆکایەتی کردن.**

١٩٥-جەنگی موئتەچۆن کۆتایی هات؟

**و/بەگەڕانەوەی سوپای موسوڵمانەکان دوای ئەوەی زیـانێکی زۆریـان لەدوژمنەکانیان دا.**

١٩٦-ئەوموعجیزەیە چی بوو کەخوای گەورە بـە پێغەمبـەر(د.خ)ی بەخشی لەجەنگی موئتە؟

**و/ پێغەمبەر(د.خ)هەمووڕووداوەکانی جەنگەکـەی دەبینـی لـەجێگای**

**خۆی لەمەدینەو یاوەرەکانیشی لێ ئاگادارەکردەوە.**

١٩٧-هۆی چی بوو پێغەمبەر(د.خ)بەجەنگی ڕزگارکردنی مەککە هەڵسا؟

**و/هۆیەکەی ئەوەبوو کەقورەیشیەکان یەکێك لەبەندەکانی سولحی حودەیبیەیان هەڵوەشاندەوە،کاتێ یارمەتی خێڵی بەنی بەکریاندا، کەبەسەرخێڵی خوزاعە دابدەن، کەپەیمانی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)بەستابوو.**

١٩٨-قورەیشیەکان کەهەستیان بەهەڵەی خۆیان کرد پێغەمبەر(د.خ)تۆڵەیان لێ دەکاتەوە چیان کرد؟ئاکامەکەی چۆن بوو؟

**و/قورەیشیەکان کۆبونەوەیەکیان کردو بڕیاریاندا ئەبوسوفیان بنێرنەلای پێغەمبەر(د.خ)بۆنوێکردنەوەی پەیمانەکە،ئاکامەکەشی ئەوەبوو ئەبوسوفیان نەیتوانی پەیمانەکە نوێ بکاتەوە.**

١٩٩-ژمارەی ئەویاوەرانە چەندبوو کەلەڕزگارکردنی مەککەبەشدار بوون؟

**و/دەههەزار یاوەربەشداریان لەڕزگارکردنی مەککەکرد.**

٢٠٠-ئەوسێ جێگایەکوێ بوون کە پێغەمبەر(د.خ)بۆخەڵکی مەککەدەست نیشانی کردن؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)سێ جێگـای بـەبێ تـرس دانـا بۆئـەهلی مەککـە، فەرمووی(ئەوەی چووە ماڵی ئەبوسوفیان ئەوەپارێزراوە،ئەوەی دەرگای لەســەرخۆی پێــوەدا ئــەوەپارێزراوە ئــەوەی چــووەمزگەوتی حــەرام پارێزراوە).**

٢٠١- پێغەمبەر(د.خ)کەچووەناو مەککە چۆن سوپای خۆی دابەش کرد؟

**و/بۆسێ بەش دابەشی کرد،١-بەشێك بەسەرۆکایەتی خالیـدی کـوڕی وەلید کەلەخوارەوەدێتە ناو مەککە.**

**٢-بەشێك بەسەرۆکایەتی زوبێری کوڕی عەوام لەلای سـەرەوە دێتـەناو مەککە**

**٣-بەشێك بەسەرۆکایەتی ئەبوعوبیدەی کوڕی جەراح.**

٢٠٢- پێغەمبــەر(د.خ)کەچــووە ناومەککــە یەکــەم ئــیش چــی بووکەکردی؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)چووەناومزگەوتی حەرام ولەدەوری کەعبە سـوڕایەوەو دەستی بەشکاندنی بتەکان کردکە لەچواردەوری کەعبـە دانـرا بـوون بەکەوانەکەی دەستی لێی دەدان و بەسەر ڕوودابەردەبونەوە.**

٢٠٣-قورەیــشیەکان چــۆن وەڵامــی پرســیاری پێغەمبــەریان داوە، کەلـەڕۆژی ڕزگـارکردنی مەککـە پرسـی، پێغەمبـەر(د.خ)چـیان لێ

دەكات، دوايی پێغەمبەر(د.خ)چۆن وەڵاميانی داوە؟

**و/پێيان گووت:چاكمان لەگەڵ دەكەيت،برايەكی چاك و برازايەكی چاكی: پێغەمبەر(د.خ)يش فەرمووی بڕۆن ئێوە ئازادن.**

٢٠٤- پێغەمبەر(د.خ)ڕۆژی دووەمی ڕزگاركردنی مەككە چی كرد؟

**پێغەمبەر(د.خ)خوتبەی بۆخەڵكەكەداو خەڵكی مەككەش بەيعەتيان بە پێغەمبەر(د.خ)دا يەكەم جار پياوەكان وپاشان ئافرەتەكان پەيمانياندا كەگوێڕايەڵی بكەن.**

٢٠٥ پێغەمبەر(د.خ)دوای ڕزگاركردنی مەككە، چەندڕۆژ لەوێ مايەوە؟لەوێ چی كرد؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)شازدە ڕۆژ لەمەككە مايەوە، بنەماكانی ئيسلامی رونكردەوەو ڕێگای ڕاستی پيشانی خەڵكەكەداو فەرمانی كرد كەبتەكان بشكێنن.**

٢٠٦-ئەوپياوەرانە كێن كە پێغەمبەر(د.خ)ناردنی بۆڕوخاندنی گەورەترين بتەكانی قورەيش؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)حاليدی كوڕی وەليدی بۆڕوخاندنی عوزاو عەمری كوڕی عاصی بۆڕوخانی سواع وسەعدی كوڕی زەيدی ئەشهەلی بۆ رووخاندنی مەنات نارد.**

٢٠٧-كەی مەككە ڕزگاركرا؟

**و/لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچی.**

٢٠٨-جەنگی حونەین کەی ڕویدا؟

**و/لەمانگی شەوالی ساڵی هەشتەمی کۆچی.**

٢٠٩-هۆی بەرپابوونی جەنگی حونەین چی بوو؟

**و/بەهۆی کۆبونەوەی هەندێ لەتیرە خۆبەزل زانەکان کەئیسلامیان ڕەت دەکردەوەو بۆجەنگ کردن لەگەڵ موسوڵمانەکان دەرچوو بوون.**

٢١٠-ناودارترین ئەوتیرانەی کەدژایەتی موسوڵمانانیان دەکردکامە بوون؟کێ سەرۆکایەتی دەکردن لەحونەین؟

**و/تیرەکان:هەوازن،ثەقیف،بەسەرۆکایەتی مالیکی کوڕی عەوفی نەصری.**

٢١١-ژمارەی سوپای موسوڵمانان لەجەنگی حونەین چەندبوون؟

**و/ژمارەی لەشکری موسوڵمانان دونزەهەزارجەنگاوەر بوون.**

٢١٢-هۆی چی بووموسوڵمانەکان کاتێك چوونە ناودۆڵی حونەین رایان کردوگەڕانەوە؟

**و/لەبەرئەوەی سوپای مالیکی کوڕی عەوف سەنگەری بۆموسوڵمانان دانا بوو لەناکاو لەهەموو لایەك تیروڕمیان بۆدەهات تیرباران کران لەئەنجامدابەناچاری شکان وگەڕانەوە دواوەو ڕایان کرد.**

٢١٣- پێغەمبەر(د.خ)چۆن توانی موسوڵمانەکان کۆکاتەوەو بیان گەڕێنێتەوە بۆجەنگ؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)بەعەباسی مامی گوت کەیاوەرەکان بانگ کاو پێغەمبەر(د.خ) روو هێسترەکەی بەرەو کافران کردو فەرمووی (بەڕاستی من پێغەمبەری خوام...من کوڕی عەبدولموتەلیبم) وموسوڵمانەکان هەموویان هاتنەوە دەوری پێغەمبەر(د.خ).**

٢١٤- پێغەمبەر(د.خ)دوای گەڕانەوەی موسوڵمانەکان بۆناوشەڕ چی کرد؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)چەنگە خۆڵێکی هێناو بەرووی دوژمنی پڕژاندو هیچ یەکێکیان نەما کەخوای گەورە چاوی پڕخۆڵ نەکردبێ.**

٢١٥-جەنگی حونەین چۆن کۆتایی هات؟

**و/بەدۆڕانی دوژمنەکان دوای چەندسەعاتێك، کە پێغەمبەری خواخۆلی بەرەو روو یان داکرد،موسوڵمانەکان دەستیان بەسەرماڵ وسامانێکی زۆری دوژمن داگرت کەجێیان هێشتبوو.**

٢١٦-هۆی ڕودانی جەنگی تائیف چی بوو؟

**و/جەنگی تایف بەدرێژبوونەوەی جەنگی حونەین دادەنرێت، چونکە زۆربەی ئەوانەی لەشەڕی حونەین دۆران لەخێلی هەوازن وثەقیف ڕوەیان لەتایف کردولەوێ خۆیان حەشاردا پێغەمبەر(د.خ)یش لەدوویان**

**چووبۆگەمارۆدانیان.**

٢١٧-بەچ ڕێگایەك خەڵكی قەڵا نە یان هێشت موسوڵمانەكان بچنەناو قەڵاكە؟

**و/بەتوندی تیربارانیان كردن و ئاسنی گەرم كراویان بۆدەناردن بۆئەوەی موسوڵمانەكان نەچنەپێشەوە.**

٢١٨-جەنگی تایف چۆن كۆتایی هات؟

**و/هەندێ لەخەڵكی ناوقەڵاكە تەسلیم بوون وهەندێكی تریش لەناوقەڵاكە مانەوە، دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ)بڕیاریدا وازیان لێبێنێ ولەشكرەكە گەڕایەوە.**

٢١٩-دوای لابردنی ئابلۆقە لەسەر تائیف پێغەمبەر(د.خ)چی كرد؟

**و/گەڕایەوەبۆناوچەی جیعرانە وئەودەسكەوتەی كە موسوڵمانان لەحونەین بەدەستیان هێنابوو دابەش كرد.**

٢٢٠- پێغەمبەر(د.خ)بەشی گەورەی دەستكەوتەكەی بەكێدا.

**و/بەشی گەورەی دەستكەوتەكەی دایە قورەیشیەكان و ئەو ئەعرابانەی تازەهاتبوونەناو ئیسلام.**

٢٢١-هەڵوێستی ئەنسارەكان چۆن بوو لەدابەش كردنی پێغەمبەر(د.خ)؟

**و/ئەنسارەكان بەودابەشكردنە تۆزێ دڵگران بوون، چونكە**

**لەڕوکەشـداعادیلانە نـەبوو چـونکە پێغەمبـەر(د.خ)هیـچی نـەدابوونێ قسەوقسەلۆکیش زۆربوو لەسەر ئەوکارە.**

٢٢٢- پێغەمبەر(د.خ)کاتێ ئەو هەڵوێستەی ئەنسارەکانی زانـی چـی کرد؟

**و/داوای لەسەعدی کوڕی عوبادەکرد کەئەنسارەکان کۆبکاتەوەو پێـی گووتن (رازی نـابن خـەڵکی کـاوڕو حوشـتر ببـەن وبـۆ ئێـوەش بـە پێغەمبەری خوداوە بگەڕێنەوە خۆتان) ئەوانیش بە پێغەمبـەر(د.خ)رازی بوون.**

٢٢٣- جەنگی تەبوك کەی ڕویدا؟

**و/لەمانگی رەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی ڕوویدا.**

٢٢٤- هۆی ڕودانی جەنگی تەبوك چی بوو؟

**و/چونکە هەواڵ بۆ پێغەمبەر(د.خ)هـات کەڕۆمـەکان و ئـەو تیرانـەی لەگەڵیانن، سوپایەکی گەورەیان ئامادەکردووە، بۆلێدانی موسـوڵمانان جا پێغەمبەر(د.خ)بڕیاریدا لەنزیك سەنگەرەکەی خۆیان شـسەڕ بکـات ڕێگایان نەدا تاوەکو ئەوان هێرش بکەن سەرموسوڵمانان.**

٢٢٥-کـێ بەشـداریەکی چـاکی لـەئامادەکردنی سـوپای موسـوڵمانان کردلەجەنگی تەبوك؟

**و/عوسمانی کوڕی عەفان.**

٢٢٦- پێغەمبەر(د.خ)لەو کاتە چی فەرمووی؟

**و/پێغەمبەر(د.خ) زۆردڵی بەوە خۆشبوو فەرمووی(دوای ئەم کارەی ئەمرۆعوسمان هەرچی بکا زەرەری پێ ناگا)**

٢٢٧-ژمارەی سوپای موسوڵمانەکان چەندبوو لەجەنگی تەبوك؟ ژمارەی سوپای رۆمەکان چەند بوو؟

**و/ژمارەی سوپای موسوڵمانان سی هەزارجەنگاوەرو ژمارەی سوپای رۆمەکان چل هەزارکەس بوون.**

٢٢٨سوپای موسوڵمانان لەتەبوك بەچی ناونرا؟

**و/بەسوپای تەنگانە (العُسْرة)ناونرا.**

٢٢٩-جەنگی تەبوك چۆن کۆتایی هات؟

**و/کەرۆمەکان وهاوپەیمانەکان گوێیان لێ بوو سوپای موسوڵمانان بەرەو روویان دێت، ترسان نەیانتوانی بێنەپێشەوەو لەناو وڵاتدا بڵاوبونەوەو سوپای موسوڵمانەکانیش گەڕانەوەو شەڕیان نەکرد**

٢٣٠- ئەو سورەتەی قورئان کامەیە کەباسی جەنگی تەبوك دەکا؟

**و/سورەتی (التوبة) یە.**

٢٣١- لەچساڵێکدا پێغەمبەر(د.خ)حەجی ماڵئاوایی بەجێ گەیاند؟

**و/لەساڵی دەیەمی کۆچی بوو.**

٢٣٢-ژمارەی ئـەو موسـوڵمانانەی چـوونە حـەجی ماڵئـاوایی لەگـەڵ پێغەمبەر(د.خ)چەند بوون؟

**و/ژمارەیان سەدو بیست و چوار هەزار کەس دەشڵێن چل وچوار هەزار موسوڵمان بوون.**

٢٣٣- دواسوپا کە پێغەمبەر(د.خ)ئامادەی کردکامە بوو؟کەی بوو؟

**و/دواسوپا کە پێغەمبەر(د.خ)ئامـادەی کردسـوپای ئوسـامەی کـوڕی زەیدی کوڕی حاریثە بوو، لەساڵی یازدەی کۆچی.**

٢٣٤- ئامانـج چی بوو لەئامادەکردنی سوپای ئوسامەی کوڕی زەید؟

**و/ئامانج ترساندنی ڕۆمەکان و وەستان لـەڕوی سـتەم کاریـەکان و زیادکردنی متمانەبوو لەدڵی موسوڵمانەکان بوو.**

٢٣٥- هۆی چی بوو سوپای ئوسامە درەنگ دەرکەوت؟

**و/بەهۆی شـپرزەنی موسـوڵمانەکان لەبەرهـەواڵی نـەخۆش کـەوتنی پێغەمبەر(د.خ).**

٢٣٦- ئەوکارانە چین کەوایان لەموسوڵمانەکان کردهەست بـەنزیك بوونـەوەی کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ)بکەن؟

**و/١-لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی دەیەمی کۆچی بیـست ڕۆژلەمزگـەوت مایەوە کەچی ساڵەکانی ترهەر دەڕۆژدەمایەوە**

**٢- لەم ساڵەدا دووجار لەگەڵ جوبیریل بەقوڕئان داچـووەوە لـەباتی**

**جارێك**

**٣-ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: کەلەوانەیە ئەوەدواجاربێ بۆ بینینیان .**

٢٣٧-کەی پێغەمبەر(د.خ)نیشانەکانی نەخۆشی لێ بەدەرکەوت؟؟

**و/لە مانگی سەفەری ساڵی یازدەی کۆچی کاتێك لەبەقیع گەڕایەوە نەخۆشی لێ بەدیارکەوت.**

٢٣٨-یەکەم نیشانەی نەخۆشی کەلە پێغەمبەر(د.خ)بەدیار کەوت چی بوو؟

**و/یەکەم نیشانەی نەخۆشی ژانەسەرێکی زۆرتوند بوو، لەگەڵ تایەکی زۆرگەرم.**

٢٣٩- پێغەمبەر(د.خ)لەنەخۆشیەکەی حەزی دەکرد لەکوێ بێ؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)لەنەخۆشیەکەیدا حەزی دەکرد لەلای عائیشەی دایکی موسوڵمانان بێت.**

٢٤٠-ئەویاوەرەکێ بوو کە پێغەمبەر(د.خ)پێی گووت: کەلەجێی ئەونوێژ بە موسوڵمانان بکا؟

**و/پێغەمبەر(د.خ)ئەبوبەکری سدیقی بەوکارە ڕاسپارد.**

٢٤١-کەی پێغەمبەر(د.خ)کۆچی دوایی کرد؟

**و/لەڕۆژی دووشەمی دوازدەی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی یازدەی کۆچی.**

٢٤٢- کاتێ پێغەمبەر(د.خ)کۆچی دوایی کرد تەمەنی چەندبوو؟

**و/تەمەنی پێغەمبەر(د.خ)شەست وسێ ساڵ بوو.**

٢٤٣- دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ)کێ شوشتی؟

**و/عەباس وعەلیو فەضل وقەثمی کورانی عەباس وشەقرانی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەر(د.خ)و ئوسامەی کوڕی زەیدو ئەوسی کوڕی خولی خوالەهەموویان ڕازی بێ.**

٢٤٤- کەی پێغەمبەر(د.خ)یان ناشت؟لەکوێ ناشتیان؟

**و/بەشەوی چوارشەمەی چواردەی ڕبیعو لئەوەل پێغەمبەر(د.خ)لەماڵی عائیشەی دایکی موسوڵمانان نێژرا،لەوشوێنەی کەگیانی تێداسپارد.**

**هەندێ پرسیاری گشتی دەربارەی ژیانی پێغەمبەر(د.خ)**

٢٤٥- پێغەمبەر(د.خ)چەندزاوای هەبوو؟کێ بوون؟

و/ **زاوایەکانی پێغەمبەر(د.خ)سێ بوون،ئەوانیش ئەبولعاصی کوڕی رەبیع زەینەبی لەلابوو،عوسمانی کوڕی عەفان ڕوقیەی لەلابوو دوایشی ئوم کولسوم، عەلی کوڕی ئەبی تالیب فاتیمەی لەلابوو، رەزای خوایان لێ بێت .**

٢٤٦-ژمارەی خێزانەکانی پێغەمبەر(د.خ)چەندن؟کێ بوون؟

**و/خێزانەکانی سێزدە بوون ئەوانیش (خەدیجەی کچی خوەیلید، سۆدەی کچی زەمعە، عائیشەی کچی ئەبوبەکر، حەفصەی کچی**

**عومەری کوڕی خەتاب، زەینەبی کچی خوزەیمە، ئوم سەلەمە، زەینەبی کچی جەحش، رەیحانە، جوێریەی کچی حاریث، ئوم حەبیبە، صەفیەی کچی حویەی، ماریەی قیبطی، مەیمونەی کچی حاریث) رەزای خوایان لیٚ بیٚت.**

٢٤٧-هەندیٚ لەموعجیزەکانی پیٚغەمبەر(د.خ)بژمیٚرە؟

**و/لەموعجیزەکانی پیٚغەمبەر(د.خ) (کەرت بوونی مانگ،ئیسراومیعراج، زۆربوونی خۆراکی کەم، موعجیزەی نەمرو هەتا هەتایی قورئانی پیرۆز)**

٢٤٨-کیٚ شاعیری پیٚغەمبەر(د.خ )بوو؟

**و/حەسەنی کوڕی ثابت شاعیری پیٚغەمبەر(د.خ)بوو.**

٢٤٩-کیٚ نهیٚنیەکانی پیٚغەمبەر(د.خ)ی دەپاراست؟

**و/حوزەیفەی کوڕی یەمان رازگری پیٚغەمبەر(د.خ)بوو.**

٢٥٠-ووشترەکەی پیٚغەمبەر ناوی چی بوو؟

**و/ناوی ئەلقەصواء بوو.**

٢٥١- پیٚغەمبەر(د.خ) چەندجارحەجی کرد؟چەندجارعومرەی کرد؟

**و/پیٚغەمبەر(د.خ) یەك جارحەجی کردو چوارجارعومرەی کردیەکیٚکیان لەکاتی حەجدا بوو.**

٢٥٢- هەندێ لەناوەکانی پێغەمبەر(د.خ)بڵێ؟

**و/لەناوەکانی پێغەمبەر(د.خ) (ئەحمەد، موحەمەد، ئەلماحی، ئەلحاشر، ئەلعاقب)**

٢٥٣- منداڵەکانی پێغەمبەر(د.خ) ژمارەیان چەندبوو؟ناویان چی بوو؟

**و/ ژمارەیان حەوتە ئەوانیش (عەبدوللا، ئەلقاسم، زەینەب، روقیە، ئوم کولسوم، فاتیمە، ئەوانە لە خەدیجەی دایکی موسوڵمانان، ئیبراهیم لەماریە بوو، ڕەزای خوایان لێ بێت .**

٢٥٤- دواسوپا پێغەمبەر(د.خ)ئامادەی کردسوپای کێ بوو، ئەوسوپایەی دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ)نێردرا؟

**و/دواسوپاکە پێغەمبەر(د.خ)ئامادەی کردسوپای ئوسامەبوو بۆیەش ئەوناوەی لێنرا چونکە سەرۆکی سوپاکەناوی ئوسامەی کوڕی زەیدبوو تەمەنی نۆزدەساڵ بوو**

٢٥٥- ئایا پێغەمبەر(د.خ)خوێندەواری هەبوو؟بەڵگەی ئەمە چیە؟

**و/نەخێر پێغەمبەر(د.خ)نەیدەزانی بنوسێ، وبخوێنێتەوە بەڵکو نەخوێندەوار بوو بەڵگەش ئەوەیەخوای گەورە دەفەرمووێ بە پێغەمبەر(د.خ)** ﴿ وماكنت تتلُوا مِن قَبلِه من كِتبٍ ولاتخطُه بِيمِنك إذاً لأرتاب الُمبطِلونَ﴾ **العنکبوت/ ٤٨.**

**واتا: تۆ بەر لەوەی قورئانت بۆ بێتە خوارێ، نەتــدەتوانی هــیچ کتێبێــك بخوێنیەوە یابەدەستی خۆت بینوسی ئەگەر وابا دڵ چەپەلان گومانیــان لێ پەیدادەبوو.**

٢٥٦- لەکورِوکچەکانی پێغەمبەر(د.خ)کامەیان پێش خۆی کۆچی دوایی کرد؟کامەیان پاش پێغەمبەر(د.خ)کۆچی دوایی کرد؟

**و/هەموو کورِ وکچەکانی پێغەمبەر(د.خ)پێش خۆی کۆچی دوایی کردتەنها فاتیمە نەبێ پاش پێغەمبەر(د.خ)بەشەش مانگ کۆچی دوایی کرد.**

٢٥٧-بۆچی پێغەمبەر(د.خ)ئەوکاتەی خەدیجەی دایکی موسوڵمانانی لەلابوو هیچ ژنێکی دیکەی نەهێنا؟

**و/لەبەرگەورەیی وپایەبەرزی خەدیجە لای پێغەمبەر(د.خ).**